# سروه

ئەدەبی ـ فەرهەنگی

١



ئینتیشاراتی صلاح الدینی ئەییووبی
ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی

گۆواری ئەدەبی ـ فەرهەنگی سروە ـ ساڵی یەکەم ـ ژمارە ١ ـ بەهاری ١٣٦٤

هەرچەن مەواچان فارسی شەکەرەن
کوردی جەلای من بەس شیرین تەرەن
مەعلومەن جە دەورەی دونیای پەر دەندیش
دلشادەن هەر کەس بە زوانی وێش
ای قوبادی

# نێوەرۆک


سەر وتار . . . . . . . . . . . . . ۳
ستایشی خودا . . . . . . . . . . . ۵
پەیامی مامۆستا مەلا محمدی رەبیعی . . ۶
کورتە باسێک لەسەر رێنووسی کوردی . . ۹
چ بنووسین . . . . . . . . . . . ۱۴
ئیدەئۆلۆژی ئیسلامی . . . . . . . . ۱۶
سالم . . . . . . . . . . . . . ۱۸
بوار . . . . . . . . . . . . . ۲۱
جوغرافیای تەبیعی کوردستانی ئێران . . ۲۴
بووکی یەکشەوە . . . . . . . . . . ۲۹
بەهار لە فۆلکلۆری کوردیدا (۱) . . . ۳۳
بەهار لە فۆلکلۆری کوردیدا (۲) . . . ۳۵
کەڵبەش چ بوون ؟ . . . . . . . . . ۳۸
حاجی رێوی . . . . . . . . . . . ۴۳
جەمیل سیدقی زەهاوی و . . . . . . . . ۴۴
بەزمی بەهار . . . . . . . . . . . ۴۸
سەرداری موسڵمانی کورد صلاح الدینی
ئەییووبی . . . . . . . . . . . . ۵۴
جووجە کەباب . . . . . . . . . . ۶۳
بیهداشت و لەشی ساغ . . . . . . . ۶۹
ئاڵەکۆک . . . . . . . . . . . . ۷۸
بەرکوتێک لەخەرمانی گۆرانی کوردی . . ۸۰
ئێمە و خوێنەر . . . . . . . . . . ۸۴
جەدوەل . . . . . . . . . . . . . ۸۵
دیاری . . . . . . . . . . . . . ۸۶
بە بۆنەی بومبارانەکەی قەلادزێ . . . . ۸۸
گەلۆ . . . . . . . . . . . . . ۹۰
نەتیجەی موسابەقە . . . . . . . . . ۹۱
پەرستار . . . . . . . . . . . . ۹۳



گوواری ئەدەبی ـ فەرهەنگی

لە ژێر چاودێری دەستەی نووسەران

ناونیشان = ارومیە خیابان شهید باکری ، نبش کوی ساعد ، انتشارات صلاح الدین ایوبی .

تلفن : ۳۵۸۰۰


## سەروتار

### سخنی با خوانندگان :

در شرایطی دست به قلم می‌بریم و نوشتن آغاز می‌کنیم که روزانه هزاران و میلیونها قلم بر صفحات میلیاردها کاغذ می‌لغزد و مقالات،کتابها نشریات و جزوات فراوانی وارد جامعه می‌گردد. بدیهی است که اینهمه کتاب و مقاله و ... اگر برای خدمت به انسانیت و برای اعتلای راستین جامعهٔ بشری به رشتهٔ تحریر درمی‌آمد شاید و بلکه البته وضع جامعه آنچنان که هست نبود و این همه ستم و زور و تبعیض و... وجود نمی‌داشت در این مختصر فرصت آن نیست که ابعاد گستردهٔ نقش قلم و نوشته‌ها را برشماریم و اصولا این کار به جهت ریشه داشتن در تاریخ گذشتهٔ حیات انسانی و تاثیر در اکثر شئون زندگی به سادگی قابل جمعبندی نمی‌باشد. و در این راستا کتب و مقالات فراوانی نوشته شده‌اند و از این پس نیز باید نوشته شوند. همینقدر بگوئیم که اگر تمامی قلمها در جهت ایجاد هماهنگی و یگانگی و دعوت به درستی و اخوت و کنار گذاشتن منیت و غرور و نفی ارزشهای کاذب و اثبات و تبلیغ ارزشهای راستین و واقعی بر روی کاغذ می‌آمدند، جهان با زدوده شدن از تصاویر فقر و گرسنگی، جنایت و خیانت، فحشا و فساد، تهدید و تطمیع و تبعیض، و... بسیار زیباتر مینمود.

آری قلم همچون تیغی است که هم میتواند در پاره کردن کالبد سرد و بی‌روح جهان و اخراج غدد چرکینش مورد استفاده قرار گیردوهم اعضا و جوارح سالم را مضروب و مجروح و چرکین سازد و روشن است که اگر این تیغ در کف زنگی مست باشد چه میشود ؟

این است که نویسندگان باید از جمله متعهد‌ترین افراد باشند که در مقام قضاوت و تحلیل وتحقیق آگاهانه و منصفانه عمل کنند وهرگز شرف و تعهد نسبت به قلم را به هیچ قیمت نفروشند و همواره حقایق و واقعیتها را بر

دوستیهای فردی و جمعی خود ترجیح داده و مرتکب جنایت بزرگ ( قلب حقیقت ) نشوند . که در آن صورت با عملی ساده آغازگر راه انحراف و مبلغ تفکر ناصحیحی میشوند که برای همیشه سرمایه‌ها و استعدادها را به بیراهه کشانده و بشریت را از دستیابی به شاهراه ترقی و سعادت ابدی محروم میسازد .

## بریده باد دستهایی که اصالت را رنگ میکنند

### چرا اقدام به انتشار این نشریه کردیم

بیشک باید هدف کلی خود را از انتشار نشریه باطلاع خوانندگان گرامی رسانده باشیم لیکن در پاسخ به این سوال که انتشار یک نشریهٔ فرهنگی و ادبی بزبان کردی چه ضرورتی دارد ؟
برای روشن تر شدن موضوع خوبست که ابتدا در مورد فرهنگی و ادبی بودن نشریه و ضرورت آن اشاره کنیم و آنگاه در مورد چاپ آن بزبان کردی به بحث بنشینیم . و اما :

**ضرورت فرهنگی و ادبی بودن نشریّه:**

هر نشریه‌ای میتواند بطور انحصاری در هر یک از ابعاد سیاسی ، اجتماعی ، اقتصادی ، ادبی ، فرهنگی ، مذهبی ، علمی ، تاریخی و ... و یا بطور اشتراکی دردویاچند موضوع طبع شود . آنچه که هست نیاز جامعه و انتخاب روشی است که با آگاهی از نیاز جامعه می تواند در ارائهٔ پیشنهادات و نقطه نظرات مثبت و سازنده موفق باشد . در این رابطه ظرافت هنر و مایهٔ فرهنگ و ادب ، ضمن ارتقا توان ما در تنفیذ هر چه بیشتر حقایق و ارتقا هر چه زیاد سطح آگاهی و شناخت و دانش حتی ساده‌ترین مردم روستا شیمان میتواند بصورتی گسترده ، طیف وسیعتری از اقشار مردم شریف و مظلوممان مفید واقع گردد . انتخاب هر یک از عناوین فوق امکان بحثهای فراوانی بلحاظ ضرورتها و نیازهای منطقهٔ محروممان بما میدهد و کار در هر یک از زمینه‌های مذکور نشریات جامع و کامل و مفیدی را بهمراه خواهد داشت اما اینکه چه مقدار از مردم ما از آن بهره خواهند برد ؟ و آیا اصولا چه میزان از عناصر جامعه از آن استقبال خواهند کرد برای ما روشن نیست . لیکن همینقدر میدانیم که بیان موارد لازم و ضروری از طریق آثار فرهنگی ، ادبی ، ودر قالب شعر و سرود و هنر و فولکلور میتواند نقد صحیح و تحلیل صحیح و تحقیق جامع را تا دورافتاده‌ترین روستاهای سرزمین سرسبز و حاصلخیز کردستان عزیزمان برده و بعنوان جاذبترین و موثرترین حرکت در رشد همگان موثر افتد .

از این رو باید یادآور شویم که فرهنگی و ادبی بودن نشریه بمعنی تحدید تمامی محتوی به بحثهای ادبی و .... نخواهد بود بلکه ما از طرح مسائل سیاسی اجتماعی و بیان مشکلات و گرفتاریهای مردم و ارائهٔ راه حلهایی در حد امکان خود استقبال خواهیم نمود . نکته‌ای که در پایان این قسمت از بحث باید مورد توجه قرار گیرد ضرورت موضوعی بحث پیرامون فرهنگ و ادبیات هر قوم و ملتی است . کسب شناخت صحیح و کافی از جامعهٔ بشری هر چند که محتاج بحث و تحقیق پیرامون تمامی ابعاد و شئون زندگی انسان است . لیکن تفحص و تحقیق در فرهنگ و ادبیات و بویژه ادبیات عامیانه و مردمی میتواند در این راه به عنوان گامی بلند تلقی شود ، زیرا ادبیات و فرهنگ هر قوم و ملتی انعکاسی از روحیات ، تفکرات و شخصیت آن مردم است و نیز از آنجا که زبان و ادبیات وسیله نقل علوم و دانشها و تجربیات و حوادث و رویدادهای تاریخی است ، بر ضرورت بازشناسی فرهنگ و ادبمان نقطهٔ ابهامی باقی نمیگذارد .

**ضرورت کردی بودن نشریّه:**

بی شک میتوان در بسیاری از ابعاد ، مقالات و کتب و نشریات فراوانی را بهر زبان دلخواه نوشت و چاپ کرد اما پاره‌ای از ابعاد هستند که قابلیت انتقال به زبانهای دیگر را نداشته و گاهاً عبارات و مفاهیم معادلی در جهت قبول بار این انتقال در زبان دوم وجود ندارد . از طرف دیگر مفاهیم سمبلیک که آمیختگی شدیدی با روحیات افکار و تاریخ هر ملتی دارد چنان منحصر به فرد است که ترجمهٔ آن هرگز نمی‌تواند بار فرهنگی آنرا با خود داشته باشد . همچنانکه شرح و بسط و تفسیر آن نیز ضمن نفی ایجاز ، ظرافت و زیبایی ، قدرت ترسیم چند بعدی آن در زمان واحد را ندارد . این معنی نه فقط در انتقال به زبان دیگر بلکه حتی در تغییر شکل آن در یک زبان واحد نیز محسوس است . مثلا اگر بخواهیم بیتی از ابیات دلنشین حافظ و مولوی و..... را به زبان فارسی معنی و تفسیر کنیم . هر چند که بروشنی و وضوح با استفاده از مفاهیم معادل و.... شرحی کامل بر آن ارائه کنیم ، زیبایی و ظرافت آنرا ازمیان برداشته‌ایم . بر این اساس در یک نشریهٔ فرهنگی و ادبی و لو آنکه عده‌ای از برادران و خواهران در خواندن متون کردی تسلط نداشته باشند استفاده از زبان کردی ضروری است . گذشته از این وقتی بحث از ضرورت شناخت فرهنگ میکنیم رابطه‌ای مستقیم با زبان دارد . در شرایطی که اکثر میراثهای فرهنگی ما در صندوق سینه‌ها حبس است کلیدی جز زبان وجودندارد .

ما در بحثهای متنوع نشریه از زبان رسمی کشورمان نیز بهره خواهیم گرفت ، زیرا همچنانکه اعتقاد داریم هر گونه حرکتهای نژاد پرستانه که زبان و ادبیات قومی را بر قوم دیگر تحمیل‌نماید و مردمی را بجرم داشتن زبان و فرهنگ متفاوت مطرود سازد ، محکوم است ، از حرکتهای کور نژاد پرستانه و ناسیونالیستی غربی نیز به شدت منزجریم . زبان برای ما وسیله است و نه هدف .

بر همین اساس با نوشتن سرمقاله به زبان فارسی ستونی را برای درج مقالات تحقیقی به زبان رسمی کشور میگشائیم تا اساتید و محققینی که احیانا به خواندن و نوشتن کردی تسلط ندارند بتوانند نتایج تحقیقات خود در زمینه‌های مختلف علمی ، فرهنگی ، تاریخی و.... را برای ما ارسال

**مفاهیم سمبلیک که آمیختگی شدیدی با روحیات ، افکار و تاریخ هر ملتی دارد چنان منحصر به فرد است که ترجمهٔ آن هرگز نمی‌تواند بار فرهنگی آنرا با خود داشته باشد . همچنانکه شرح و بسط و تفسیر آن نیز ضمن نفی ایجاز ،ظرافت و زیبایی ، قدرت ترسیم چند بعدی آن در یک زبان واحد نیز محسوس است . مثلا اگر بخواهیم بیتی از ابیات دلنشین حافظ و مولوی و....را به زبان فارسی معنی و تفسیر کنیم . هر چند که بروشنی و وضوح با استفاده از مفاهیم معادل و....شرحی کامل بر آن ارئه کنیم ، زیبایی و ظرافت آنرا برداشته‌ایم . بر این اساس در یک نشریهٔ فرهنگی و ادبی و لو آنکه عده‌ای از برادران در خواندن متون کردی تسلط نداشته باشند استفاده از زبان کردی ضروری است .**

بسم الله الرحمن الرحیم

## ستایشی خوا

حاجی قادری کۆیی

ئەی بێ نەزیر و هەمتا ، هەر تۆی کە بەرقەراری
بێدار و بێدیاری ، بێدارو پایەداری

بۆ باغی مەردی باغی ، سەرمایەکەی خەزانی
بۆ مەزرەعی فەقیران ، سەرمایەکەی بەهاری

بۆ پادشا نیشانی ، بۆ هەر سەوادی ئەعزەم
بێسەدر و شانشینی ، بێپەردە و پەردەداری

جەبباری بێ فتووری ، سوڵتانی بێ قسووری
رەززاقی مار و مووری ، ئاودێری دێمەکاری

فەیرووزە تەختی گەردوون، مەسنووعی نەقشی تۆیە
یاقووت و لەعلی رۆژە ، ئەستێرەکان دوراری

جێ و مەکانی تۆیە ، بێ جێ و بێ مەکانی
لەیل و نەهاری تۆیە ، بێ لەیل و بێ نەهاری

هەر ئەمری تۆ مەدارە بۆ کار و باری عالەم
هەر چەندە بێ وەزیر و بێ سەدر و کار و باری

سەحرا نەوەردی ئەوقت خورشید و ماهی تابان
دوو جاریەن شەو و رۆژ بێ مەحمەل و عەماری

مەعلوومە بۆچی حاجی مەدحت دەکا بە کوردی
تا کەس نەڵێ بە کوردی نەکراوە مەدحی باری

و جایی برای درج آنها در نشریه یافته باشند .

امروز چاپ نشریه و کتاب بزبان مادریمان برای مردم مظلوم و محروم این خطه مفهوم دیگری هم دارد و آن احساس ارزش و احترامی است که سالیان درازی در نتیجهٔ حکومت جابران وستمگران از آن خبری نبوده است اما اینک در نتیجهٔ خونهای سرخی که ریخته شده و انقلاب شکوهمند اسلامی ایران را به پیروزی رساند قانون اساسی بعنوان چهارچوب پاسداری از دستاوردهای آن به تصویب رسید . انتشار چنین نشریاتی نه تنها در کردستان ، بلکه در هر جای دیگر کشور آزاد است . و ما که سالیان درازی از این نعمت محروم بوده‌ایم باید از این فرصت نهایت بهره را برده‌و در این مقطع نقش خود را در خدمت به مردم عزیز و محروم و مظلوممان ایفا نمائیم و در این باره از تمامی صاحبنظران و دست اندرکاران محترم دعوت میکنیم تا با همکاریهای خود ما رادر ایفای رسالت و انجام وظیفه مدد فرمایند .

**آخرین سخن:**

نشریه‌ای که اینک در دست عزیزان است حاصل تلاش برادرانی است که با استفاده از مقالات ارسالی از سوی عزیزان شرکت کننده در مسابقهٔ بزرگ علمی و ادبی انتشارات صلاح الدین ایوبی و دیگر مطالب در ابعاد مختلف تهیه و پرداخته شده است . بی شک تلاش ما این خواهد بود که در شماره‌های آینده نشریاتی با محتوای بیشتر ومفید تقدیم خوانندگان گرامی نمائیم . بدیهی است پیشنهادات و انتقادات شما در مورد شکل ، قطع ، و نوع مطالب نشریات بعدی چراغی فرا راه آیندهٔ ماست . تا با آگاهی بیشتر در ارائهٔ کیفیت برتر توان خود را بیافزائیم .

در اینجا مجددا از همهٔ هنرمندان ، شعرا ، ادبا ، نویسندگان و.... جهت همکاری با انتشارات صلاح الدین ایوبی و هیئت تحریریه مجلهٔ " سروه " دعوت میشودتا ضمن مراجعه حضوری و یا مکاتبه با آدرس : ارومیه. صندوق پستی ۷۱۷ . خیابان شهید باکری . نبش کوی ساعد. انتشارات و کتابفروشی صلاح الدین ایوبی ما را مورد لطف قرار دهند .

توفیق همگان را از خداوند بزرگ مسئلت مینمائیم .

هیئت تحریریه

## پەیامی مامۆستا مەلا محەمەدی ڕەبیعی «ئیمام جومعەی ئەهلی سوننەتی باختەران»

# لەسەر بڵاوکردنەوەی گۆواری «سروە»

سوپاس بۆ ئەو خودایە کە بە هۆی قەڵەمەوە زانستی پیشانی ئینسان‌دا و ئەوەی نەیزانیوە فێری کردووە دروود و سەلام بۆ گیانی پاکی پەیغەمبەری خاتەم کە فەرموویەتی ( لە لانکەوە تا گۆڕ لە دوای زانست بگەڕێ ) وە هەر وا سەلام لە بنەماڵە و یارانی بەڕێزی ئەو سەروەرە گەورەیە کە سەرچاوەی ئەدەب و زانیاری وپاکی بوون .

زۆر خۆم بە بەختیار دەزانم کە بۆ یەکەم جار ئەرکێکی پڕ لە شانازیم پێ سپێردراوە سەبارەت بە فەرهەنگی گەلەکەمان .

لەپێشدا سوپاسی مامۆستا هێمن دەکەم کە ئەم خزمەتەی پێ سپاردووم ئەگەر بەکەڵکی خزمەت بێم ، ئەنجا بە پێویستی دەزانم کە لە کاربەدەستانی فەرهەنگی کۆماری ئیسلامی ئێران،سوپاس بکەم کە لەم‌بارەوە یارمەتی‌یان داوین هیوادارم هەموو موسوڵمانان پێکەوە لە تەواوی قۆناخەکانی ژیاندا بە تایبەت لەباری فەرهەنگی‌یەوە سەرکەون تا لەهەموو شوێنێکدا فەرهەنگی بێگانە ریشەکەن بکرێ و فەرهەنگ‌ئەدەبی ئیسلامی ونەتەوایەتی جێگای خۆی بگرێتەوە .

ئەم گۆوارە ( سروە ) سەرەتای بەهارێکی سەوزە بۆ گوڵاڵەجۆربەجۆرەکانی گوڵزاری ئەدەبی کوردستان کە لە درێژایی مێژوودا ستەمکاران زۆر حەولیان داوە بۆ ژاکاندن بەڵکە بۆ خنکاندنی! ژاکا بەڵام نەخنکا سەرئەنجام گەشەی کرد و خۆی نواند و پیلانی دوژمنی تاساند و لە مەیدانی ئەدەبی جیهانیدا خۆی ناساندەوە .

خوای گەورە بە چەشنێک ڕێزوحورمەت بۆ زبان دادەنێ کە لە ئایەتی ۴ سوورەتی ۱۴ دا دەفەرمێ ( ئێمە نەمان ناردووە هیچ پێغەمبەرێک مەگەر بە زبانی گەلەکەی خۆی هەتاسپاردەکانی ئێمەیان.بە زبانی خۆیان پێ ڕاگەیەنێ )۰

فەرهەنگی کوردی لەگەڵ خواپەرەستی و ئینسان ویستی دا ئاوێتەیە وەکوو عەتر و ڕەنگی گوڵ.ومانای (کلمه‌طیبه) وتەی خاوێن و جوان.ی بەسەردا ڕاست دێ ، هەر وا خوای گەورە دەفەرمێ: ( نموونەی وتەی جوان و خاوێن وەکوو دارێکی پاک و ساغە کە ریشوەکەی لە ئەوپەڕی دامەزراویدا بێ و لق و پۆی چووبێتە ئاسماندا و لەهەموو کاتێکدا ( چوار فەسڵە ) میوەی خۆی دەدا بە یارمەتی خوا ) ئایەتی $\frac{۲۳}{۱۴}$ هیوادارم ئەم گۆوارە هەموو کاتێک بە بەر بێ و هەموو تەبعێکی ڕاست و ڕەوان لەبەرو بووی بحەسێتەوە و گەشەی پێ بکا .

گەلی کورد فەرهەنگێکی دارا و بەر- بڵاوی هەیەبەڵام لە درێژایی مێژوودا پژ و بڵاو بوەتەوە پێویستە کە زانیا- ران و هۆنەران و لێکۆڵەوان و هەستیاران و فەرهەنگ ویستان تێکوشن بۆ کۆکردنەوەی . سەرەنج نەدان وبایەخ دانەنان بۆ ئەم زبانە گەوهەر پەروەرە لە لایەن دوژمنانی فەرهەنگ و ئەدەبی نەتەوایەتی یەوە ، بوە هۆی ئەوە کە شوێنەوارە گرانبایی و کەم- وێنەکانی زۆربەی نووسەران وهۆنەرانی کورد بخرێنە لاوە و لە نێو خۆڵ وخاکی ژیانی دەردناکی خاوەنەکانیاندا بشاردرێنەوە یا لەگەڵ دەربەدەری‌یاندا لاپەڕەیکی کەوتبێتە توون و بەکێکی بە تەبەس و ڕەنجیان بێ وەربێ .

ئەوەی شایانی باس بێ ئەمەیە : خەم و خەفەتی ڕۆژگاری ڕابوردوو دەردی ڕۆژگاری ئێستا دەرمان ناکا و چاوی فرمێسکین ڕێگا نادۆزێتەوە . غیرەت و تێکۆشان لەڕێگای دۆزینەوەی،شوێنەواری بایەخداری ئەم گەلە و هەروا بەکار- هێنانی بیر و مێشک و قەڵەم بۆزیندوو

راگرتنی ئەم فەرھەنگە درەوشەر و پاک و خاوێنە و بۆ گەشاندنەوەی هەر چی زیاتری ، رێگای چارەسەری دەردە ، باب و دایک و گەورەی هەر منداڵێکی کورد بەڕاستی دەبێ هەستی لێ پرسراوی بکا و هەڵی بنێ لە سەر فێر بوونی زبانی گەلەکەی و ناسینی فەرھەنگ و ئەدەبی باوباپیری کە سەرانسەر شەرەف و رێز و جوانمێری و شانازییە و هەروا راسپێری و وەسیەتیشی پێبکا کە ئەم ئەمانەتە بداتە دەستی چینی داھاتوو ، ئەگەر نە خەیانەتی کردوە بە گەل و نیشتمان و فەرھەنگ و ئەدەب و نەتەوەکەی و تاوانبارێکی تەواوە ، وەکوو ئەو خۆ فرۆشانە کە لە نێو لانکەوە منداڵەکانیان ئەدەنە باوشی فەرھەنگی بێگانەوە تەنانەت نایێلن کە بڵێن: " بابە ، دایە " بە " پاپی ، مامی" زبانی ئەو بەستەزبانە دەکەنەوە ! و لە جێگای ناوی خوا و پێغەمبەر ودوعا و سەلام، فێری " گود بای"و" تانکیۆ"و " هەلاو"ی دەکەن !!!

بە راستی ژیانی هەرگەلێک بریتی‌یە لە فەرھەنگەکەی ، ئەگەر سەرەنجی مێژوو بدەین ئەم راستەقینەمان بۆ دەردەکەوێ کە هێزە داگیرکەرەکان لە وڵاتە داگیرکراوەکاندا ، پێش‌لە هەموو شتێک فەرھەنگی خۆیان بەسەر ئەواندا دادەسەپێنن و کەم کەم نەتەوایەتی و فەرھەنگی ناوخۆیی‌یان لێ دەدزن و لە بیریان دەبەنەوە و ئەمەش بە هۆی بەرز و پێشکەوتوو پیشاندانی فەرھەنگی داسەپاو و بێ بایەخ و دواکەوتوو پیشاندانی فەرھەنگی نەتەوایەتی ئەو گەلەوە سەری گرتوە ! واتە :گەوهەریان لێ دەستێنن و خلێرەیان دەدەنێ ،باری منەتیشیان لەسەر دادەنێن و بۆڵەشیان بەسەردا دەکەن کە فێری تەمەددونی جەدیدیان کردوون !!!

لە پێشدا زبانەکەیان لە پێش چاو خستوە و ئەمجار جل و بەرگەکەیان لەبەرداکەندوە و ئانجا ئەڵقەی خولامی‌یان کردوەتە گوێ و کۆتی دیلی‌یان خستوەتە پێ و تەوقی لەعنەتیان بردوەتە مل و خستوویانەتە پۆتڵ ! هەر بۆ پێشەوە ، پێشکەوتوو هەی پێشکەوتوو .

ئەو چینە بزان و نەزان چوونەتە ژێر باری بێگانە ، بەڵام چینی داهاتوو بە ناوی میراتی باوباپیریان گرتوو - یانەتە باوەشەوە ، ئەوا فەوتان و تەواو بوو ، مەگەر وا نیە ???...

کاتێک گەلێک فەرھەنگی نەتەوایەتی خۆی لە دەست‌دا مێژووی را دەوەستێ، بەڵکە مێژوویەکی نیە وەهتنا ئەمەو کارەساتە درێژەی هەبێ بێ مێژوویی درێژەی هەیە و ئەو گەلە مردوون،کاتێک داچڵەکان و دەستیان دا تێکۆشان بۆ بەدەست هێنانی فەرھەنگەکەیان ، تازە گیانیان کەوتووەتە بەر ، و مێژووی پەککەوتوویان دەکەوێتەوە جم و جۆل و ئەو راپەڕینە سەرەتای مێژووی ژیانی نوێی ئەو گەلەیە .

لەم بارەوە زۆرمان وت ، پێویستە ئاشیرە بکەین بە دەرمانی دەود یا رەمزی رزگاری : رزگاری لە بێگانە : بێگانە لە نیشتمان ، بێگانە لە ئایین ، بێگانە لە ژین .

رەمزی رزگاری خوێندەوارییە رێگای سەرکەوتن ئاگاداریە چەکت قەڵەم بێ قەڵخانت کتێو خوێندنگەت سەنگەر هیوات هەواپێو ئەگەر بە هیوای سەر نەخەوێنی ئەبێ تێکۆشی زۆر چاک بخوێنی لە چەرخی بیستەم نومرەی کەم‌لەبیست هۆی دواکەوتنە وهەست ئەکاتە نیست قەت رازی مەبە بە کاری خراو بە کەم تەرخەمی و دەرسی ناتەواو ئەزانی چۆنە دەرسی ناتەواو ؟ شایانە بێژین کە لاوی ر خاو قوتابی تەمەڵ دایم سەرکزە کەلاوەی ر خاو رێبازی دزە کەلەوەر مەخە قەڵای خوێندنت رێبلز ساز مەکە بۆرێی دوژمنت چەوسێنەر وەک دز بۆ شوێن ئەگەڕێ شوێنی نەدەیتێ ، لە دوور ئەوەڕێ

بەڵێ ، با هەموو بزانن رێگای سەرکەوتن زانیارییە و خوێندن هاوڕێ لەگەڵ هیوا و ئیمان بە خودا ، چەک و کەرەسەی سەرکەوتنیشمان راگەیانند قەڵەم و کتێب و قوتابخانە و زانکۆ و زانستگە . برای کوردم تێکۆشە زانیار بیت هەتا کەسەرۆک و سەردار بیتە تێکۆشە مافی خۆت و دیگەرانیش بناسی هەتاکە مافت‌ژێر پێ نەبێ و مافی دیگەرانیش ژێرپێ نەکەی ، تێکۆشە بە مەحەکی زانست دۆست و دوژمنت بناسی هەتاکە دۆست لێت نەتەواسێتەو دوژمنت تاسێنێ ، هەرچەند، بۆ خۆت خۆتت تاساندوە و نیازی بە دوژمن نیە بت تاسێنێ ، چونکە نەخوێندەواری بێ‌سەر و دەری لە دەرمانخانەی ژیانی جیهانیدا لە باتی شەوبەتی سینە زەهری هەلاهیەلت پێ دەفرۆشن و لەباتی دەرمانی ژانەسەر، مەرگەموشت دەخەنە کۆش ، یا لە نێو زەهری هەلاهیەل و مەرگی مشکدا دەت‌کەنە سەر پشک ،بەڵام

سروە ٧ ← ل ٦٢

# تەشریفی نەو بەهار

تەشریفی نەوبەهارە کە عالەم دەکا نوێ
دڵ چونکە میسلی غونچەیە بۆیە دەپشکوێ

لەم وەعدە خۆشەدا گوڵ و گوڵ چیهرە تێکەڵن
یەکڕەنگ و موتتەحید بە دڵ ، ئەمما بەتەن جوێ

عەرعەر عەدیلی قەددەیە ، یەعنی بەرابەرن
سونبول شەبیهی زوڵفییە ، فەرقی نییە موێ

لەم خۆشییە کە هێزمی مەتبەخ سەوز بووە
ماوم عەجەب لە دیدەیی سۆفی کە نارِوێ

تیپی شکۆفە خەیمەیی داوە لە هەرتەرەف
یا شاهی نەوبەهارە ، هەڵی داوە هوردوێ

دنیا کە گوڵگوڵی بووە ، قوربان ئەتۆش وەرە
تالیب بە گوڵ بە ، قەیدی چیە گوڵ گوڵی بوێ

بولبول کە گەرمە نەغمەیی ، ئاگر دەکاتەوە
غونچە حەزینە ، جەرگ و دڵی بۆ دەکا توێ

"نالی" زوبانەکەی تەڕ و پاراوی سۆسەنت
حەیرانی چاوی نێرگسە ، وەک لالە نادوێ

نالی

# کورتە باسێک لەسەر رێنوسی کوردی

## بەشی یەکەم

ئەوەی لێرەدا دەیخەینە بەر باس ، لێکۆڵینەوەیەکی قووڵی زانستی لە سەر رێنووسی زمانی کوردی نیە ، بەڵکوو کردنەوەی دەرگایەکە بۆ ئەوەی مامۆستایان و شارەزایانی‌زمان وئەدەبی کوردی لەم رێگایەوە بۆچوون و بیر و ڕای خۆیان لە سەر ئەم مەسەلە گرینگە دەرببڕن ، و هیوا ـ دارین لەدوای راگەیاندن و بڵاوکردنەوەی بۆچوونە جۆراوجۆرەکان دەرەتانی ئەوەمان بۆ پێک بێ لە باشترین و بەکەلکترین و زانستی‌ترین رەخنە و پێشنیارەکان بۆ لابردنی کەم و کووڕی ئێستای رێنووسی کوردی بەهرە وەرگرین ، و نووسەران و خوێنەرانی کورد لەو گێژاوە رزگار بکەین کە هەر یەکە و یا خۆ هەر دەستەیەک لە نووسەران بۆ خۆی رێنووسێکی هەڵبژاردوە و بەرێگای‌دڵخوازی خۆیدا دەڕوا ، و بەداخەوە پاشاگەردانی‌یەکی ئەوتۆ پەیدا بوە کە خوێنەر سەری لێ دەشێوێ .

ئەگەر ئێمەش لەگۆوار و بڵاوکراوەکانی خۆماندا رێنووسێکی دەست نیشانکراومان نەبێ و هەر مەقالەیەک ، هەر شیعرێک ، هەر نووسراوە و کتێبێک بەپێی رێنووسی هەڵبژێردراوی نووسەرەکەی بڵاو بکەینەوە دیارە بێگومان سەرلێشێواویەکی زیاتر بۆ خوێنەر پێک دێ . کەوابێ دەستەی نووسەرانی گۆوار هاتە سەر ئەوبڕوایە کە بۆ دەست پێ کردن و درێژەدان بەکاری خۆی رێنووسێکی تاقانە لەبەرچاو بگرێ و لەهەموو بڵاوکراوەیەکی خۆیدا چ کتێب بێ و چ گۆوار یا رۆژنامە و ... و شتی‌تر لەو نەزمە لانەدا . ئەوەش بەومانایە نیە کە دەمانەوێ رێنووسێکی تایبەتی بەسەر زمانی کوردیدا بسەپێنین و هەموان ناچار بە پەیڕەوی لەو نەزمە بکەین ، بەڵکوو هەروەک پێشتر گوتمان تەنیا مەبەستمان ئەوەیە لانی کەم لە گۆوارێکدا چەند شێوەنووسینی جۆراوجۆرمان بڵاو نەکردبێتەوە کە بەداخەوە زۆر نموونەی وامان دیوە. ئەوەش لە لایەکەوە نیشانەی بێ‌سەرە و بەرەیی کارەکەمان دەبێ و ، لە لای‌تریشەوە سەرلەخوێنەران دەشێوێنێ

هەروەک لە دیاری کردنی زمانی یەکگرتووی کوردیدا هەست بەو پێویستی‌یە گرینگە دەکرێ وسەرەڕای هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر کە تا ئێستا لە لایەن زۆرێک لە ئەدیب و نووسەرو شارەزایانی زمانی کوردی‌یەوە دراوە ، هێشتا ئەو مەسەلە جێگای باسە و دەبێ زیاتر شی بکرێتەوەولە پاشان کۆڕێک لە شارەزایان و خوبرەکانی زمان ناسی بڕیاری دوایی لەسەر بدەن ، بۆ هەڵبژاردنی رێنووسی یەکگرتووی کوردیش رێگایەکی دوور و درێژمان لەپێشدایە . لە سەر زۆر شت مامۆستا و ئەدیب و نووسەرەکانمان بۆچوونی وەک یەکیان نیەو رەنگبێ زۆر بەتوندیش نەزەری یەکتر رەت بکەنەوە. هەربۆیەش بەبڕوای ئێمە باشترین رێگای چارەسەر کردنی ئەم گیروگرفتە کردنەوەی مەیدانێکە بۆ باس و لێکۆڵینەوەی زانستی ، و چ مەیدانێکیش

لە گۆوارێکی ئەدەبی ـ فەرهەنگی باشترە ؟

هەر چەند دەقی نووسراوەکان شێوە رێنووسی هەڵبژێردراوی ئێمەتان بۆ روون دەکاتەوە بەڵام بە پێویستمان زانی مەسەلەکە زیاتر شی بکەینەوە . و لەسەر هێندێک خاڵی تایبەتی لە بۆچوونی نووسەرانی دیکەش بکۆڵینەوە و دەلیلی پێویست بۆ رەت کردنەوەی برێک لەو نەزەرانە رابگەیەنین.

**دووپاتی دەکەینەوە کە نامانەوێ ئەم رێنووسە بەسەر زمانی کوردیدا بسەپێنین چاوەڕوانیمان لە هەموو شارەزایانی زمان و ئەدەبی کوردی ئەوەیە کە، رەخنە و ئامۆژگاری ـ یەکانی خۆیانمان بۆ بنووسن و رێنوێنیمان بکەن بەڵام داوەری بە خوێنەرانە و ئێمە درێژە بەم شێوە نووسینە دەدەین تا زانایانی کورد شێوەیەکی دیکە پەسەند کەن .**

**ئەلف و بێی کوردی :**

لە ئەلف و بێی کوردیدا وەک هەر زمانێکیتر دووچەشنە پیت هەن : "دەنگ" و "دەنگ بزوێن" .

یەکەم: دەنگ ، کە لەفارسیدا " حروف بیصدا " لەعەرەبیدا "صامت" و لە ئینگلیسیدا " Consonants " ی پێ دەڵێن و بریتین لەم ٢٩ پیتە : ئ،ب،پ،ت،چ، چ،ح،خ،د،ر،ڕ،ز،ژ،س،ش،ع،غ،ف،ڤ،ق،ک،گ،ل،ڵ،م،ن،و، ه،ی،: و ئەگەر "ڕێ" ("ر" و "ڕ") بە یەک پیت و "لام" ("ل" و "ڵ")یش بە یەک پیت دابنێین ژمارەی دەنگەکانی ئەلف و بێی کوردی دەبن بە ٢٧ پیت .

تێبینی ١ : پیتی "ڤ" زیاتر لە لەهجەی کوردی شیمالدا هەیە ، بۆ پتر روون کردنەوە دەبێ بڵێین لە زمانی ئینگلیسیدا دوو پیتی " V " و " W " هەن کە بۆگوتنی " V = ڤی " ددانی سەروو لەسەر لێوی خواروو دادەنرێ ، بەڵام بۆگوتنیپیتی" W =دا بڵێوو" ئەوکارە ناکرێ و هەر دوولێو کۆدەبنەوە و شکڵی ئاڵقەیەک پێک دێنن . پیتی "و" لەزمانی عەرەبی و کوردی جنووبی و ناوەندیدا وەک " W " دابڵێووی ئینگلیسی تەلەفوز دەکرێ ، جگە لەچەند وشەیەکی وەک "گڤە" و "بڤە" و ....و لە فارسی و لە لەهجەی کوردی شیمالدا وەک " V "، بۆ وێنە وشەی " واوان " لە کوردیدا وەک " Wawan " و لە فارسیدا وەک " Vavan " دەخوێندرێتەوە. ئەوەیە کە ئەو کورد زمانانەی لە فارسی قسەکردنیدا لەهجەیان هەیە و هەروەها ئەوفارسی زمانانەی کە کوردی و عەرەبی باش فێر نەبوونلە خوێندنەوە و تەلەفوز کردنی پیتی " و "دا دوچاری هەڵە دەبن .

بەڵام بۆ زمانی یەکگرتووی کوردی کە لە وشە و زاراوەی هەموو ناوچەکان کەلک وەردەگیرێ هەر دوو پیتی " W " و " V " بەکار دەبرێن کە بۆ پیتی یەکەم لە دەنگی "و" و بەجێگای پیتی " V " لە پیتی " ڤ " ئیستیفادە دەکەین ، وەک " مرۆڤ " " گڤە " ، " بڤە " ، ....

تێبینی ٢: زۆربەی ئەو وشانەی کە لە کوردی و فارسیدا هاوبەشن و پیتی "و"یان تێدایە هەر بە شکڵێک دەنووسرێن بەڵام لە خوێندنەوەدا جیاوازن بۆ وێنە " دیوار " هەم لە کوردیدا و هەم لە فارسیدا بە " و " دەنووسرێ بەلام لە فارسیدا وەک " Divar " ولە کوردیداوەک " Diwar " دەخوێندرێتەوە .

تێبینی ٣: هێندێک ماموستا و ئەدیبی کورد وەک ماموستا محمد امین زەبیحی لەو بڕوایەدان کە پیتی " ص " کە لە چەند وشەی کوردی وەک " صەگ " و " صەد " و ....دا دەبینرێ دەبێلەریزی ئەلف و بێی کوردیدا جێ بکرێتەوە، بەڵام هێشتا ئەو پێشنیارە بەتەواوی جێگر نەبوە. هەروەها بۆچوونێکی ئەوتۆیش لەسەر "ط" و "ظ" کە لە لەهجەی کوردی شیمال بە شێوەیەکی جوێ لە " ت " و " ز " تەلەفوز دەکرێ ، هەیە .

تێبینی ۴: لە هێندێک جێگا عەلامەتی " ˇ " لە سەر پیتی " ڕێ " دادەنێن وەک : " ڕ " . پێمان وایە ئەو عەلامەتە لەژێرەوە دابنرێ چاکترە،چونکووبۆپیتەکانی تریش

لەسەرەوە دادەنرێ و لە نووسیندا ئالۆزی پێک دێنێ . بۆ وێنە ئەگەر بە جێگای " شۆڕشگێڕ " ، " شۆڕشگێڕ " بنووسین جوانتر و ساکارترە .

تێبینی ٥: پیتی " رێ " ئەگەر یەکەم پیتی وشەبێ هەر بە شێوەی " رێ "ەقەڵەو ( یانی ڕ ) دەگوترێ وەک : ڕاست ، ڕێبوار ، ڕەوەند ، ڕۆڵە .... کەوابێ بۆ ئاسانتر بوونەوەی نووسینی کوردی لە دانانی نیشانەی " ٧ " لەو جیگایانەدا خۆدەپارێزین و هەرچەند " ڕ "یش بخوێندرێتەوە هەر بە " ر " دەیان نووسین وەک : رێبوار ، رەوەند ، رۆڵە و .... لە هێندێک شێوە نووسینیشدا " رێ "ەقەڵەو بە شکلی " رر " دەنووسن وەک : رراست ، مەرر ، .... کە شێوەنووسینێکی ناحەزە و لەو جیگایانەشدا کە لە وشەیەکدا " رێ " تەشدیدی هەبێ چوار " رێ " دەکەونە لای یەکەوە و ناحەزییەکەی زیاتر وەبەر چاو دەکەوێ وەک : بڕەک ، زەڕڕە ، هوڕڕە ، موکەڕڕەڕ.... کە دەبن بە بررررەک ، زەرررره ، هوررررە ، موکەرررڕەرر ، و....

تێبینی ٦: کاتێک پیتی " و " بکەوێتە نێوان پیتێکی بێ دەنگ و بزوێنی " ێ " وەک خوێن ، شوێن ، کوێن ، کوێر ، بوێر و .... لە خوێندنەوەدا حاڵەتێکی تایبەتی بەسەردا دێ کە ئینسان وادەزانێ ئەو پیتە لە " و "ی ئاسایی جیاوازە و هەر بۆیەش هێندێک نووسەر نیشانەی " ^ " ی لە سەر دادەنێن ، وجاری وایە نیشانەی " ٧ " لە سەر " ێ " لادەبەن و یاخۆ نیشانەی " ¯ " ی لەسەر دادەنێن ، کە پێمان وایە کارێکی دورست نەبێ چونکوو بزوێنی " ێ " هەر وەک خۆی دەخوێندرێتەوە و دەبێ هەر وەک خۆیشی بنووسرێ و نیشانەی " ٧ " ی لەسەر بێ . نیشانەی " ^ " یش لە سەر " و " بنووسرێ و نەنووسرێ لە خوێندنەوەیدا تەئسیرێکی نابێ و ناتوانین بەشێوەیەکی تری بخوێنینەوە کەوابێ ئەو نیشانە زیادی یە،و دانەنرێ باشترە .

تێبینی ٧: پیتی " ک " و " گ " هەرکات لەپێش بزوێنی " ێ " و " ێ " دا بێن بەشێوەیەکی نائاسایی دەخوێندرێنەوە و هەر بۆیەش هێندێک نووسەر نیشانەی " ^ " یان لە سەر دادەنێن ، وەک : " کێو ، کێ ، کێسەل ، پاکێ ، گێشە ، سەگێ هار ، گێل و .... هەر وەک لە تێبینی ٦ دا بۆ پیتی " و " گوتمان لێرەشدا بەبوون یا نەبوونی نیشانەی " ^ "

پیتی " ک " و " گ " هەر بە یەک شێوە دەخوێندرێنەوە و دانان و دانەنانی ئەو نیشانەیە نە لە تەلەفوزدا و نە لە ماناد‌ا جیاوازییەک پێک نایەنێ ، کەوابێ دانانی ئەو نیشانەیە کارێکی زیادی یە و دای نەنێین باشترە .

دووهەم : " دەنگ بزوێن " کەلە فارسیدا " حروف صدادار " و لە عەرەبیدا " حرکە " و لە ئینگلیسیدا " Vowels "ی پێ دەڵێن ، و بریتین لە حەوت بزوێنی : " ا ، ە ، و ، وو ، ۆ ، ی ، ێ " .

تێبینی ٨: بزوێنی " و " لەجێگای " پیش " ی فارسی و " ضمە " ی عەرەبی بەکار دەهێنرێ . وەک : " کُرد=کورد " و " حُسن = حوسن " . بزوێنی " وو " لەجێگای بزوێنی "و" ی فارسی و عەرەبی دەنووسرێ . وەک : " دور = دوور " و " هود = هوود " . بزوێنی " ۆ " تایبەت بە زمانی کوردی یەو لە زمانی فارسی و عەرەبیدا نیە ، هەر بۆیەش نیشانەی " ٧ " ی لە سەر دادەنرێ .

تێبینی ٩: لە نووسینی بزوێنی " وو " دا رای جۆراوجۆر هەیە . هێندێک بە شێوەی " وٓ " ی دەنووسن کە بەبڕوای ئێمە شێوەنووسینێکی ناپەسەندە . چونکوو لە لایەکەوە دانانی نیشانەی " ـ " لە سەر " و " دەبێتە هۆی زۆربوونی نیشانەکان و ئالۆزبوونی رێنووس ولە لای دیکەشەوە لە نووسین بە دست و تایپ کردندا دانانی " ـ " ماوەیەکی پێ دەچێ و نیازی بە دەست هەڵبڕین هەیە ، لە حاڵێکدا نووسینی " وو " کارێکی ئاسانترە و لە پیت چنینی چاپیشدا بۆ " وٓ " دەبێ پیتێکی جیاواز دروست بکرێ، کەوابێ هەم لەباری جوانی و رێک و پێکی نووسینەوە و هەم لە باری ئیمکاناتی فەننی یەوە نووسینی"وو"لە"وٓ" باشترە .

هێندێک نووسەری کوردیش چ لە جێگای " پیش =ضمە " و

ل ٣٧ ←

# گوتم بە بەختی خەوالوو

حاجی قادری کۆیی

گوتم بە بەختی خەوالوو وەرە ئەتۆ بی خودا
لە خەو هەڵستە زەمانێ بچینەوە ئەولا

گورەی بەهاری یە ئێستێکە شاخ و داخی وڵات
پڕە لە لالە و نەسرین و نێرگسی شەهلا

لە گرمە گرمی سەحاب و لە هاژەیی باران
چیایە پڕ لە هەرا و نوالە پڕ لە سەدا

پڕە لە سەیل و لە گوڵ ئاووکانیرووبی زەمین
پڕە لە بەرق و بریقەی بترووسکە جەووی سەما

شکۆفە دەرهەمی شاباشی بادی وەعدە دەکا
لە شەوقی مەقدەمی خەملیوە دار و بەردی چیا

پیالەیی زەڕی نێرگس لەسەر کەفی سیمین
پڕە لە شەونمی وەک دوڕڕی لوئ لوئی لالا

گوڵیش بە پەنجەئی پیرۆزی جامی یاقووتی
لە بۆ نیساری موهەییایە پڕ لە زێڕ و تەلا

لە شادی وەک سەفی شایی لە کێو و کەژ ئەزهار
هەزار بە خەلعەتی گوڵگوون دەکەونە رەقس وسەما

چەمەن لە لالە میسالی خەتی روخی دولبەر
سیاە چادری لێ بۆتە خالی سەر گۆنا

لە کن وەنەوشە و و خاو و هەڵاڵ و بەیبوونی
هەڵاڵی پێستەی خاوە عەبیر و موشکی خەتا

چیا لە تەوقەسەری دارژاوە تا کەمەری
چو زولفی سونبولی دەرهەم چو پەرچەمی بەڕەزا

بە جۆش و ئاگری گوڵناری کانی هەڵدەقوڵێ
میسالی دیدەیی وامیق لە حەسرەتی عەزرا

قەڵاتی زێوی رماوە هەرەس بە تۆپی نەسیم
سوپاهی لالە و گوڵ ، چادری لەجێ هەڵدا

لە گۆمە شینێ کە قاز و مراوی دین ودەچن
نەزپری مانگ و ستارەن لە قولزومی مینا

شنەی نەسیمە سەدای ئاوی سافی سەر قەڵبەز
بە ورشە ورشی گیا شەنگەبی بووە شەیدا

خرنگ وهۆڕی قورینگ و قەتاری سی لەسەران
دەیەت و کەو دەفڕێت و شەهێن چریکە دەکا

لە پیرە پیر و لە سمکۆڵی پیرە گا کێوی
دەلەرزێ گاوی زەمین و دەترسێ گاوی سەما (١)

لە دەنگ و دووکەڵی شینە تفەنگی نێچیروان
میسالی سونبولی زولفی کە تێک بچێ بە سەبا

چیایە شێخ و کەوای سەوزە مێزەری بەفرە
سیواکی چووزەرە رێواسە تەیلەسانی گەڵا

چەمەن لە لالە و رەیحان و نەستەرەن ئیمڕۆ
شەبیهی سوبح و شەوە ئافتابی وەختی زوحا

چنار و عەرعەرە دەفزەن هەزارە نەغمەسەرای
گیاش زاکیرە تەسبیحی شەونمی لە مەلا

لە ژووری مێگەلی هەورە لە ژێری مێگەلی مەڕ
شەبیهی گوڵشەنی خەزرایە توودەیی غەبرا

لە کێو و کەژ کە سەر ئێوارە دێنەوە ماڵات
لە دەوری چادری ساحیبی مەوجی دا وێستا

لە حیلە حیلی کەحێل و لە بارە باڕی مەڕی
لە دەنگی قۆڕەیی گاجووت و بۆڕەیی مانگا

لە گورگە قاڵ و حەپەی سەگ لە قارەقاڕی بزن
لە عەکسی دەنگی دوبارەی کە دێتەوە لە چیا

لە ئۆحە ئۆحەیی گاوان و قیرە قیڕی شووان
لە بگرە بەردەیی کابان دەبێتە حەشر و حەلا

مەلائیکەی سەری تاق و رەواقی مینایی
دەیەنە جونبوش و لەرزین دەکەونە رەقس و سەما

کە هەڵکرا شەوێ ئاگر لە کونجی رەشماڵان
خەجیل دەبن لە زەوایایی خەیمەیی والا

عوتارید و زوحەل و ئافتاب و ماهی تەمام
خولاسە سابیت و سەییارە تا دەگاتە (سوها)

(١) بورجی سوور

سەبا دەزانی ژیانم لە دووریان مەرگە
دەسا وەرە بە کزەی خۆت خەجیل بکە عیسا

ئەگەر منم لە فیراقیان کزەم لە جەرگەوە دێ
ئەگەر دڵە وەکوو جەرگم دەڵێی ئەوا سووتا

لە پاشی ئەم هەموو دەستانە بەختی خەوئالۆود
میسالی ئەژدەری نوستوو بە رق لەخەو هەستا

جوابی دامەوە ئەمما جوابێکی وا رەق
نەما مەجالی مەقال و موباحیسەی لەم و لا

وتی هەتاکوو خەزان و بەهار و زستانە
مەداری عەیش و مەوالیدی عالەمی غەبرا

بەهاری وا هەموو ساڵێ دەبێتەوە ئەمما
ئەمانە دەچنە دیاری مەمالیکی عوقبا

یەکێکی نایەتەوە چوونیان هەر ئەو چوونە
لە شێخ و عالیم و جاهیل لە پادشاه و گەدا

مەکانی شەوقی بەعێلانە پەشمە کۆنە هەوار
حەیاتی زەوقی بە ئەحبابە، بایە، ئاو و هەوا

رەفیقی کۆنە نەماون جوانەکان پیرن
بەشەق دەڕۆن و لەدوورێ دیارە شەق و عەسا

لە دووسەدی یەکی زۆر زەحمەتە بناسییەوە
مەگەر بە ناو و نیشان و بە خزم و باب و برا

کە بێی و بچیەوە تۆ ئێستەکانە هەم دیسان
سەفەر دەکەی لە وەتەن دەچیە شاری (جابولقا)

خولاسەیی قسە ئێستێکە مەسڵەحەت ئەمەیە
بڵێی بە وەجهی نەسیحەت بە کاغەز و ئینشا

ئەمان کوڕانی رەفیق و برادەرانی وڵات
بە ئێوە هەر کە گەییشت ئەم کەلامی بێ سەر وپا

لە پاش ئەوەی کە نەسیحە و موتالەعەی بکرێ
بە یادی من لە بەری کەن لە رووبی میهر و وەفا

هەتا لە خیتتەیی بێگانە فەخری پێوە بکەم
لە بەینی زومرەیی ئەحیا و مەجمەعی مەوتا

ونی مەکەن وەکوو ئاساری نالی و کوردی
لە سەهوی چاوێ بپۆشن گوزەر بکەن لە خەتا

نیە لە مومکینی ئیمکان خەتا و سەهوی نەبێ
بە غەیری خاجەیی دیوانی (عالم الاسما)

ئەوی حەسوود و نەزانن لەئیم و رەخنە گرن
لە عەیب و رەخنەیی عالەم بەری دەبن ئودەبا

ئەمانە زادەیی ئەفکار و خۆشەویستی منن
ئەگەر قەبیح و کەریهن وەگەر شەل و ئەعما

میسالی فەرخەیی ژووشک کە پێی دەڵێ دایکی
ئیلاهی قاقومە، باخۆ سەموورە یا دیبا

لە جەشنی جۆڵە کە رازی نەبێ بەسەر دڕی خۆی
مەڵێن فەساحەتی کوردی بە فارسی ناگا

بەلاغەتێکی هەیە هیچ زمانێ نایگاتێ
لەبێ تەعەسسوبی کوردانە بێ رەواج و بەها

کە خۆتی تێنەگەیەنی و لە نوکتەکانی نەگەی
دەڵێی هەمووی هەزەیانە خوا بەڵای لێ دا

بەڵام ئەوانە کە سەڕڕافی زێڕ و زێوی قسەن
چ شا رەوایە دەزانن چ سیککەیەکە رەوا

چ حیکمەتێکە کە ئاساری کوردە ناموسی
نە کیمیا و نە عەنقا لە بەیتی ئێمە نەما

ئیلاهی نەیخەیە بەر چەنگی مەندەمۆری لەئیم
نقوودی (حاجی) کە نەیدیوە خوسرەو و دارا

ئەمین بە وایە نەسیب و ئەگەر یەکێ وابێ
بە خێری باووک و دایکی لە رێی خودا بیبا

گەلێ قسەم لەدڵا بوو حیکایەتم مابوو
کە جی لە بەختی کەجم نووکی خامە لێرە شکا

# چ بنووسین ؟

عەلی حەسەنیانی

ئەدەبی کوردی وەک ئەدەبی زۆربەی نەتەوەکانی دی بریتی یە لە دوو بەشی " شێعر " و " پەخشان " کە هەر کام لەو بەشانە لک و پۆیەکی زۆریان لێ دەبێتەوە. سەدان ساڵە لەسەر شیعری کوردی کار دەکرێ و لەهەمووموەزووعێکدا و لە گشت شێوەووێنەیەکدا شیعر گوتراوە. بەڵام لە پەخشاندا هەر چەند زۆر کتێب نووسراوە و وەرگێردراوە دەبێ بڵێم کە لە چاو شیعر، هیچ کار نەکراوە و لەو بارەدا هێشتا لە پلەکانی سەرەتایی پێشکەوتداین و بۆ ئەوانەی کە دەتوانن بنووسن رێگا ئاوالەیە و مەیدانێکی بەرین و بێ سنوور چاوەنواڕی یان دەکا.

**بۆ رێنوێنی ئەو لاوانەی کە ئیستیعدادی نووسین و مەیل بە خزمەتیان هەیە چەند شوێنێک نیشان دەدەم کە دەتوانن وێڕای خزمەت بە ئەدەبی کوردی بە کەمێک زەحمەت کێشانناو دەرکەن و بێنە ریزی نووسەران**

بە تێکڕایی ئەو شتانەی کە دەکرێ کاری لە سەر بکرێ سێ بەشن :

**١ـ وەرگێڕان** : ئەوانەی کە لە زمانە بێگانەکاندا شارەزان دەتوانن نووسراوەی باش و بەکەلک وەرگێڕن دیارە لەو بارەدا تەنیا شارەزا بوون بە زمانێکی کە نووسراوەکەی پێ نووسراوە بەس نیە و وەرگێڕ دەبێ ئەدەبی کوردیش باش بزانێ. لە وەرگێڕاندا مەرجی هەرە گرینگ پاراستنی ئەمانەتە واتا وەرگێڕ حەقی نیە هێندێک لە نووسراوەکەی دەربا وێ و وەلای نێ یان نووسراوەکەی بگۆڕێ یان بە مەیلی خۆی شتێکی لێ زیاد بکا. هەر وەها وەرگێڕ دەبێ ویست و داخوازی کۆمەڵی لە بەر چاو بگرێ و نووسراوەیەک وەرگێڕێ کە داواکاری بێ.

ب ـ خولقاندن : ئەو شتانەی کە نووسەر دەتوانێ بە زەوقی خۆی بیانخولقێنێ بریتین لە :

١. " چیرۆک " کە بۆ خۆی چوار بەشە :

* چیرۆکی درێژ " رومان " .
* چیرۆکی نیوە درێژ " رومانس " .
* چیرۆکی کورت " نووێل " .
* چیرۆکی کورتی کورت .

٢. شانۆ .

٣. کتێبی غەیری چیرۆک .

٤. مەقالە .

ئەو شتانە دەتوانێ هەموو چەشنە مەبەستێک بگەیەنێ وەک زانستی، کۆمەڵایەتی، ئەدەبی، ئەخلاقی، فەلسەفی، پێکەنینی و ....

ج ـ لێکۆڵینەوە : کە بریتی یە لە دوو بەشی گرینگ : رووداوەکان و فۆلکلۆرەکان.

یەکەم، رووداوەکان کە دوو بەشە :

١. روو داوە مێژوویی یەکان : وەک " ساز کردنی قەڵای هەلاکۆ لە کوردستاندا " کە ئێستاش گوندەکەی بە ناوی " قەڵای ئەڵڵاکۆ " لە نیزیک بەندی میاندواو لە سەر چەمی جەغەتوو هەر ماوە.

لە لێکۆڵینەوە و نووسینی شتی مێژوویدا نووسەر دەبێ تەعەسسوبی نەبێ و ئەوەی کە لە نووسراوەکانی مێژوونووسـاندا هاتوە لە گەڵ ئەوەی کە بۆ خۆی پێی گەیشتوە بێ غەرەز و بێ نەزەر بێنێتە سەر کاغەز.

٠٢ روو داوە غەیری مێژوویی یەکان : وەک " رووداوەی ئەشکەوتی گەوەرێ " . لە بارەی روو داوە غەیری مێژوویی یەکاندا دەبێ تەواوی ئەو شێوانەی کە گێردراوەتەوە لە بەر چاو بگیرێ و ئەوانەی گێرا ویانەتەوە ناو ببرێن .

دووهەم ، فۆلکلۆرەکان = فۆلکلۆری کوردی کە بەشێکی گرینگ لە ئەدەبی کوردی پێک دێنێ یەکجار زۆرن و هەرچەند لەم سالانەی دواییدا هێندێکیان کار لە سەر کراوە هێشتا رێگەیەکی بێ بڕانەوە لە پێش ئاشقە نووسینماندا هەیە .

لە بارەی فۆلکلۆرەکاندا نووسەر یان لێکۆڵێنەر نابێ وشەکان بە مەیلی خۆی بگۆڕێ یان وشەیەک کە پێی وایە بێ‌ مانایە توور هەڵدا . دەبێ وشەکان چۆن دەبیسێ هەر ئاوایان بێنێتە سەر کاغەز و ئەگەر پێی وایە وشەیەک بێ مانایە یان ناحەزە یان مەبەست ناگەیەنێ دەبێ بێ‌دەست لێدان و دەست تێ وەردان لە وشەکە ، لە نێو پارانتێزدا یان لە ژێر نووسراوەکەدا شی بکاتەوە و نەزەری خۆی دەربڕێ . هەر وەها ئەگەر دوو یان چەند شێوە یان وێنە لە دەست دابێ و لە وشە یان جوملە یان مەوزووعدا دژایەتی‌یان بێ ، دەبێ باسی گشتیان بکا و ئیشارە بکا کە پەیوەندی لە گەڵ کام وێنە یان شێوەدا هەیە .

لە کوردیدا فۆلکلۆری جۆر بە جۆرمان هەیە کە دەکرێ کاریان لە سەر بکرێ و لێیان بکۆڵدرێتەوە وەک ئەمانە :

١. بەیت = لە سەر هێندیک بەیت وەکوو " مەم و زین " و " دمدم " و.... کار کراوە و کتێب و مەقالە نووسراوە بەڵام لە بارەی ئەوانی دی یان کار نەکراوە یان ئەگەر کاریش کراوە زۆر کەمە و وە بەر چاو نایە . لێکۆڵینەوە لە بارەی بەیتەکاندا زۆر باش دەتوانێ بە روون کردنەوەی وەزعی سیاسی و مێژوویی و کۆمەڵایەتی رابردوو یارمەتی بدا . بەیتەکان جۆر بە جۆرن لە مەقالەی " شاری وێران " کە لە کتێبێکی جیاوازدا چاپ کراوە ئیشارەم پێ کردوون .

٢. ئەفسانە = زۆر مەوجوود یان جێگا لە فۆلکلۆری کوردیدا بووەتە ئەفسانە و لە زۆر فۆلکلۆراندا بە شێوەی جۆر بە جۆر ناو دەبرێن . ئەو ئەفسانانە یان عموومیەتیان هەیە و لە سەرانسەری کوردستاندا لە گەڵیان ئاشنان وەک : " ئەفسانەی دێو و درنج " و " ئەفسانەی ئاوی حەیات " . یان تایبەتی ناوچەی یان شارێکن وەک " ئەفسانەی

پیرەژنە چنگ ئاسنینە " کە تایبەتی مەهابادە .

٣. چیرۆک ( حەکایەت ) = لە کوردیدا چیرۆک یەکجار زۆرە چەشنی :

ـ چیرۆکی ئاشقانە وەک " دەنکە هەنار "

ـ چیرۆکی عاتیفی وەک " مووروی دەنگی " کە لە مەڵبەندی مەریوان بە " دەنگە وەڕە " ناو بانگی هەیە .

ـ چیرۆکی ئایینی وەک " شێخ مەند و شێخ رەش " .

ـ چیرۆکی مندالان وەک " مەڕۆکە و بزنۆکە " .

ـ کورتە چیرۆکی پەندی وەک " بەرخۆڵە " .

..........

٤. مەسەل : لە کوردیدا لە بارەی هەر مەوزووعێکدا یەک یان چەند مەسەل ( ضرب المثل ) مان هەیە . لە وڵاتی ئێمەدا " مەلا غەفووری حافیز " کتێبێکی لەو بارەدا هەیە و زۆربەی مەسەلەکانی بە نەزم دەرهێناوە کە جێگای رێزە . مەلا غەفوور تەنیا مەسەلەکانی کۆ کردۆتەوە بەڵام لێکۆڵینەوە لەو بارەدا کارێکە کە دەبێ فەرامۆش نەکرێ.

لە بارەی مەسەلدا دەبێ مانا و جێگەی بەکارهێنانی و ئەگەر بکرێ چلۆنایەتی سازبوونی مەسەلەکە بەر چاو ، بگیرێ . هەر وەها ئەگەر مەسەلێک چەند وێنەی هەبێ دەبێ هەموویان لە بەر چاو بگیرێ وەک :

میریلەیان دەبردە شوشتنێ مووروولەیان دەکردە گردنێ

کە بەم شێوەش بەکار دەبەن :

میریلە دەمرد ، مووروولەیان دە گەردنێ دەکرد .

٥. هەتەڵە و مەتەڵە ( مەتەڵ ) = وەک :

ئاسمانی ساوە و پەڵە پەڵەی هەورە

مافوورەی چندراو دەسکاری گەورە = ( دەسرەی هەوری )

یان :

ئەوە چیە هەتا نەیبەستی ناڕوا ؟ = ( کاڵە و پێڵاو )

٦. روسمەکان = لە کوردەواریدا روسمی جۆر بە جۆرمان هەیە کە جێگای سەرنجن و دەگەڕێنەوە سەر بیر و بڕوای باوک و باپیرانمان وەک روسمی " قوڵە چوار شەممۆ " و " هەتەرێ و مەتەرێ " و " بێڵێندانە " و " شێوەکانی زەماوەند و گۆوەند " .

٧. بڕواکان = هێندێک شت هەن کە گەلەکەمان بڕوایان پێ هەیە وەک : " بووکە بارانە " یان " شەمۆڵە " یان " نەڕشتنی ئاوی کولێو بەشەو " یان " نەحس بوونی ١٣ "

# ئیدەئۆلۆژی ئیسلامی

مەکتەب و ئیدەئۆلۆژی ئیسلامی چیە؟ و چون تاریف دەکرێ؟ چ پێویستە کە مروڤ وەک تاکێک یا ئەندامی کۆمەڵێک، پەیرەوی قوتابخانەیەک بێ و بڕوا و ئیمانی بە ئیدەئۆلۆژیەک بێ؟ ئایا بوونی مەکتەبێک بۆ فەردێک یا بۆ کۆمەڵێکی ئینسانی پێویستە؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە دەخەینە سەر ئەستۆی عەلاقەمەندان و خوێنەران.

ئیسلام بنەڕەتی ئیمان و بڕوا بە خودای مەزن و بەرزی لەسەر بناخە و پایەی بەندەیی و ئیتاعەت لە خوای خاوەن دەسەڵات و گەورە داناوە. عیبادەت و بەندەیی و پەرستن هەر بۆ خودایە و غەیری وی نابێ کەس بپەرسترێ خوای بویە دەپەرستین کە خالیقی جیهان و ئینسانە و لەش و گیان ئەو پێی بەخشیوین. ئەگەر تاوێک نیعمەت و پیتی ئەو و هەودای بەزەیی ئەو بپسێ، هیچ لە هەستی و بوون نامێنێتەوە. کەسێکی کە خوای بە زانا و توانا و ئاگا و ... دەزانێ، یانی بڕوای وایە کە خودا لە هەموو جێگایەک حازرە ولە هەموو کار و جوولانەوە تەنانەت بیر و نیەتی ئێمە ئاگادارە و گەورە و گچکە و سووک و سەنگین بەهێز و بێهێز لە بەرانبەر ئیرادەی ئەودا یەکسانە و ... هیچ کاتێکی وەدوای گوناه ناکەوێ و لە ئالوودەیی و ناپاکی دەپارێزرێ هەمیشە خەریکی باش کردنی خۆی و باشتر کردنی خەڵکی دایە. چونکە دەزانێ خوا ئاگای لە هەموو کرداری ئەو هەیە ستەم ناکا و بەندەکانی خودا ئازار نادا. و لەرادەی توانایی خۆیدا دەگەڵ ستەم و زۆرداری خەبات دەکا. چونکە خۆی لە بەرانبەر خوادا دەبینێ، لەبەر ئەوە تێدەکۆشی کە کار باش ئەنجامبدا و خوای لە خۆی رازی بکا. چونکە بڕوای بەوە هەیە کە خودا ئاگای لە هەموو ئاکار و بڕیارێکی ئەو هەیە. هیچکاتێک ناکەوێتە بیری گوناه و سووکایەتی و هەرزەیی و زۆرداری بە پێچەوانە لە سەرانسەری ژیانی خۆیدا تەنیا ئەو نیەتەی هەیە کە بە کۆمەڵی خۆی و بە موسڵمانان و بێبەشان و بێ دەسەڵاتان کۆمەک بکا. و بارێک لەسەر شانی ئەوان دابگرێ و لە رێگای باش کردنی وەزعی دینی و دنیایی ئەواندا هەنگاو هەڵبگرێ.

چونکە پلەی ئیمان و بڕوا بە خودا لە بەندەیی و ئیتاعەتدا دەبینێ و دەیەوێ قانوونی خودایی قایمتر و جێگرتر بێ. لەبەر ئەوە ریز لە دینی خودا دەگرێ و دەزانێ و باوەڕ دەکا کە خودا تاک و بێهاوتایە.

ئیسلام تەواوی ئوسوول و مەوازینی لەسەر ئەم بناخە دامەزراندوە کە خودا یەکە و بێ شەریک و هاوتایە و بێجگە لە خوا هیچ بۆ پەرستنێ نابێ. (اشهد ان لا الله الا الله) دەبێ لە دڵی هەموو موسڵمانێکدا جێ بگرێ. شایەدی دەدەین خودایەک نیە جگە لە خودا و شایەدی دەدین کە موحەممەد پێغەمبەری خودایە. ئەو شایەدیە هێڵەکانی ئیدەئۆلۆژی ئیسلامی دیاری دەکا و تایبەتیەکانی رووناک دەکاتەوە. و بناخەی ئیسلامییەت لەسەر ئەو پایە دادەڕێژێ.

ئەگەر ئیسلام بناخەی کۆمەڵ لەسەر ئەم ئەسڵە دانێ، و وەک دیاردەیەکی بێ وێنە و تاقانە لە جامیعەی بەشەریدا خۆ نیشان بدا. بێ گومان لەگەڵ هەموو ئەو نیزامانەیدا کە تا ئێستا ناسراون و دنیا بە خۆیەوە دیویە، جیاوازی دەبێ و... جونکە ئیسلام دەگەڕێتەوە سەر ئەسڵێک کە تەواوی بوونی داگرتوە.

ئیسلام قانوونێکە کە تەواوی کائینات و هەستی دادەگرێ. بەرنامەی سازندەی تەواوی هەستیەکانە نەک هەر بۆ ژیانی مرۆڤ. بنەڕەتی مەکتەبی ئیسلام لەسەر بڕوایە کە هەموو شت ئەو خولقاندویەتی. هەموو بەئیرادەی ئەو هەن و پەیدا بوون و قانوونی ئەوە کە نەزم و رێک و پێکی دەدا بە مەوجوودات و تەواوی جوولانەوەکانیان و ئەوان رێک وپێک دەکا. رێک و پێکی و نیزامێکی ئەوتۆ کە تێک جوونێ بە وجوود نەهێنێ و ناتەبایی پەیدا نەکا و نەبێتە هۆی تێکەڵاو بوون و دابڕان.

مـزگێنـیدا بـە سـروە بای بەهاری:
واهـاتەوە نەورۆزی کـوردەواری
بە تیشک تێک شکا : سوپای کرێـوە
هەواری رۆژ گەیـشتە خاکەلێوە ...
فەرمان درا بە سەوزە سەر هەڵێنێ
جیدی لە بەندی خاکی رەش نەمێنێ
با دەرکەون ، کوڵ و کەسەر بنێژن
با رۆژی رزگاری بکەن بە جێژن ...
شەماڵ ..گەواڵ گەواڵ هـەور بنێرێ
ئاهەنگ و بەزمی جەژنی پێ بسپێرێ

* * * * *

حیلکانەوە لەو موژدە ئاودڕ و خڕ
رەش بوونەوە : ریشی سپی جیای جڕ
جلۆ گەشایەوە و بزەی لە سەر لێو
پۆتراکی خۆی رازاندەوە :بەگۆی زێو
هەور لە دەشت و شیو و پۆپە شاخان
کردی بە تۆپ تەقاندن و چراخان
مرواری بێ ژمـاری دادەبـاراند
لە دارودەر رووتی وندەاری تاراند
شەماڵە ..گاڵە گالێەتی و لەکارە..
هەڵگرنەوە : شاباشـی شـای بەهـارە
شینکە بە گەل .لەگەڵ سەری دەرێنا
هەریەکە چەند قل و پەلی بە شوێنا
خڕی بەرۆک پڕن لە دەنکە باران
تازە و تەڕن بۆ کۆڕو بەزمی یاران
نەورۆز مشتی پڕ گەلاّی تـەلایـە
هەر کارگە بێ بەلاّ بێ ..بێ گەلاّیە
ئەگەر چی ساوایە بەهاروو باشـە
لە چاوی بەد بە دووربێ گیا هەراشە

بەیەک یەکەو بەکۆ لە دەشت ودەردا
وەک کیژەکورد هەمووی گوڵێ لەسەردا
شالوور و بولبول سەرەڕۆی ئەوینن
هەر چاوە چاویانە گـولاّن ببینن
هەر مەلە بۆ گوڵێ دڵێ ئەخوێنێ
هەر گوڵە بۆ دڵداری خۆی ئەنوێنێ
نەرگسی مەست لە زەردە زیڕە زیزە
بە جوانی خۆی دەنازێ ،زۆر بەفیزە
وەنەوشە مل کەچە لەحاند پەپوولە
رێی داوە بێ وتەی مەلا و پسوولە
وا کیژ و لاویش دەچنە دەر لە دێ وە
لە رێوە تێک دەگەن ژوانگە کێوە
گۆرمزە ، مام رێواس و هەندرێشن
بۆ دڵتەڕان بەهانەن و لە جێشن
گۆوەند لەکەوشە .دوورلەوشکە سۆفین
دەرفەتە : مەم کوشین و هەڵگلۆفین
شادن بەیەک: مەل و گوڵ و دڵ و دڵ
بەیەک ئەگەڕلە :بن دەوەن، لەسەرچڵ

* * * * *

هەر من لەدووریتۆ: هەژار و داماو
دەڕوانمە رێگەکەت بە چاوی پڕ ئاو
بەشم هەتا لەشم لە تـۆوە دوورە :
هەنیسک و هەڵمژینی ئەشکی سـوورە
خشڵی گولاّن، بەژن نەمامی چاو کاڵ
وەرە دەرمخە لەو ژیانی وا تاڵ
من بولبولم لە ناڵەدا بـەزاندن
گەرم و گوڕی دڵم دڵی تـەزاندن
بمگەیە ،خۆ بنوێنە ، دڵ بستێنە
بازاڕی گەرمی نازی گـوڵ بشکێنە .

شاعیرانی کورد

چاو خشاندنێک بەسەر مێژووی پڕ لە تەنگ و چەڵەمەی هونەری کوردی زۆر مەبەستمان بۆ دەر دەخا . یەکەم ئەوە کە زۆربەی هونەروەرانی ئێمە شاعیر بوون و تەنیا بەشێک لەو دوایییەدا دەستیان بە پەخشان نووسین و چیرۆک نووسین کردوە و لە نێو ئەوانیشدا زۆربەیان هەرکاری وەرگێڕانیان رەچاو کردوە و هونەری وڵاتانی دەرەوەیان بەکورد ناساندوە جا ئەوانە تا چ رادەیەک سەر کەوتوون ئەوە شوێنەوارەکانیان لەبەر چاوی خەڵکە و خەڵک بۆ خۆیان دەبێ لەوبارەوە نەزەر بدەن .

بەڵام ئێمە زانای وامان بووە کە بەو جۆرەی شیاوی ناسینە ، نەناسراون یان ئەگەر دەستەیەک خەریکی ناساندنیان بوون هەر بە ساڵی لە دایک بوون و لە ناو چوونیان براوەتەوە کە چی زۆر جێگای داخەهێندێک شوێنەواری شاعیر و نووسەرەکانیان کۆ کردۆتەوە و حازرنین بە هیچ شێوەیەک بیدەنە بەر چاو خەڵک و خەڵک ئەوانە بناسێ . جا نازانم مەبەستیان لەو کارە چیە " اللە اعلم"

لە نێو خۆمان دەر نەچێ زۆرن ئەو مامۆستایانەی کە شوێنەواری خۆیان داوەتە دەست چەند کەس کە بۆیان رێک و پێک کەن و چاپی بکەن بەڵام ئەوان زۆر بەبێ بەزەیی ئەو کارەیان نەکردوە و تەنانەت بەو ئاواتەوە کە رۆژێک شوێنەوارەکەیان بکەوێتە دەست خەڵکی هەژار و لێ قەوماوی کورد سەریان ناوەتەوە ئاواتەکەیان بردۆتە ژێر گڵ.

بە راستی ئەو جۆرە ئینسانانە دەبێ رۆژێک سزای ئەو کارەیان لێ بستێندرێتەوە چون خەیانەت بە زمانی کوردی کلک و گوێی نیە . ئەوەش جەشنە خەیانەتێکە . بەراستی ئەگەر تا ئێستا هونەری بێگانەمان بە کورد ناساندوە و چاوبزمان داوە ئێستا جێگای خۆیەتی کە هونەری کوردی بە دەرەوە بناسێنین . ئەویش بە شێوەیەک کە واقیان وڕ بمێنێ وسەریان سوڕ . رەنگبێ بەرچاوتەنگ نەبووبین و بە درێژایی مێژوو ئەوەی کە بۆ خۆمان ویستوە بۆ دراوسێ کەشمان داوا کردوە و زمان و فەرهەنگی رەسەنی دراوسێکانمان لە لا بەڕێزبووە . هەر وەک خانای قوبادی خاوەنی شیرین و خوسرەو لە بارەی زمانی فارسیدا دەڵێ :

**هەر چەن مەواچان فارسی شەکەرەن**

**کوردی جەلای من بەس شیرین تەرەن**

**مەعلوومەن جە دەور دنیای بەد ئەندێش**

**دڵشادەن هەر کەس وە ز وانا وێش**

لەوکاتەدا کە زمانی خۆی پێ شیرنە زمانی فارسیش بە شەکر دەزانێ بەڵام کێهە نووسەر هەتا ئەورۆ توانیویەتی ئەو مامۆستایە بە خەڵک و بە تایبەت بە دراوسێ کانمان بناسێنێ . ئاخر ئەوەتان لە بیر بێ کە ناساندن لەگەڵ پێ هەڵگوتنی ئەدەبی جیاوازی زۆرە . رەنگبێ ئەو عەیبانە لە منیشدا بێ بەڵام من بە ئاشکرا پێ لە عەیبی خۆم دەنێم و پێم شوورە یی نیە و خۆ هەڵناکێشم .

بەهەر حال ئەوە گلەییەکی برایانە بوو ، دەردی دڵێک بوو . لە مێژ بوو ئەوەم لە مێشکی دا بوو ئێستا کە ئەو دەرفەتە هەڵکەوت ئەوا دەیخەمە سەر کاغەز و نایشارمەوە و شەرت بێ ئەوەی وە دەستم کەوێ بە زووترین کات بڵاوی بکەمەوە. بەڵام لە بارەی چلۆنایەتی باس کردنی ماموستایەکی شاعیر کە شیعرەکانی دەتوانن ئەو بناسێنن ئەو ماموستایە سالمە. سالم کێیە . زۆرن ئەوانەی یەک دوو شیعریان لە سالم بیستووە و لە زۆر جێگاشدا بە ناوی شاعیر پێیان هەڵگوتووە کە بە بڕوای من ئەوانە هیچی نابنە دیاردەی ناسینی سالم . ئەوەی راست بێ ئەوەیە کە سالم ئەوەیە :

سالم " کە ناوی عبدالرحمن یان بە زاراوەی کوردی " ئەوڕەحمانە " کوڕی محمود بەگی " قەرە جەهەننەم"ی کوڕی ئەحمەد بەگی " صاحبقران "ە. ئەو شاعیرە ئامۆزای مستەفا بەگی شاعیرە کە بە نازناوی " کوردی " نێو بانگی دەرکردوە هوی ئەوە کە نازناوی " سالم " ی بۆ خۆی هەڵبژاردوە رەنگبێ ئەوە بێ کە وەک لە مێژووی ئەدەبی کورد نووسراوی رەفیق حیلمی دا هاتوە پیاوێکی لەڕ و لاواز بووە و زۆر کەم لەشی ساخی بە خۆیەوە دیتوە و هەر بە ماوەی چەند حەوتووجارێک لە لای حەکیم بووە و لە حەیفان نازناوی سالمی هەڵبژاردوە سالم لە ساڵی ١٢٢٠ لە دایک بووە و لە تەمەنی ٦٣ ساڵیدا کۆچی دوایی کردوە .

ئەوەش پێویستە رابگەنین کە لە سەرەتای دیوانەکەیدا کە لە ساڵی ١٩٣٣ ی زایینی لە لایەن کوردی و مەریوانییەوە لە شاری بەغدا لە چاپدراوە دەڵێ : لە پێشدا ناز ناوی " رەنجوور " بووە و بە ناز ناوی " بیمار " یش شیعری داناوە . جێگای لەدایک بوونی شاری سلێمانی بووە و هەر لەوێش لە تەنیشت گۆڕی مصطفی بەگی ئامۆزای نێژراوە .سالم شێوازی شیعر گوتنی لە ماموستاکانی پێش خوی وەرگرتووە. بەڵام ئەوەی روونە لە نێوەرۆکی شیعرەکانیدا دەر دەکەوێ رووخانی حکوومەتی ( بەبە ) تەئسیرێکی زۆری لەسەر هەستی شاعیرانەی داناوە. بنە ماڵەی صاحبقران لە کوردستانی ئێرانیشدا هەبوون و رەنگبێ بۆ سەردانی خزمانی هات و چۆی ئێرانیشی کردبێ . بۆیە شیعری بەشارەکانی ئێران هەڵگوتوە. و بەدوای رووخانی حکومەتی ( بەبە )دا چوتە " تاران " بەڵام لەوێ نەحەساوەتەوە و بەم شیعرە هەستی خۆی دەربڕیوە:

خۆزگە ئەمزانی لە تاران نەجاتم کەی دەبێ؟
کۆی یارم مەشهەدە یا مەنزڵم هەر رەی دەبێ؟

بەدوای ئەوەشدا لە قەسیدەیەکدا دیسان گلەیی دەکا و دەڵێ:

لەگەڵ دڵ شەرتە سالم گەر نەجاتم بێ لە تارانا
بەهەشت گەر بێتە دەشتی رەی گوزەر ناکەم بە ئێرانا

ماموستا پیرەمێرد لە ناميلكەی دوازدە سوارەی مەریواندا باسی قارەمانەتی صاحبقڕانەکان دەکا و ئەوە بە بڕوای من وا دەردەخا کە ئەو بنەماڵەیە هەمیشە شاعیر و هونەرمەندیان بووە . یەکەم شیعری دوور و درێژی سالم کە بە هۆی رووخانی حکوومەتی ( بەبە ) داناوە لە گۆڤاری " گەلاوێژ"دا چاپ کراوە . ئەو شیعرە بەر لەوە کە قەتعەیەکی ئەدەبی بێ، تابلۆیەکی مێژوویییە و بەسەر هاتی ئەو سەردەمەدەگێڕێتەوە. بەو شێوەیە :

( ذکر محاربە بندگان میر جلیل الشان عزیز بیگ بابان با طائفە رومی)

لێم گەڕێن با گۆشەگیر بم، دەستە ئەژنۆ کەف زەنان
گێژەلۆکەی بای نەدامەت تاری کرد سەفحەی جیهان
بەزمی سەیدی ئێمە سەیادی فەلەک تارێکی کرد
رەنگە باڵای تیر قەددان بێتە تەرکیبی کەمان
زەعفی تالع جازیبە بۆ کارەبا بۆ خوێن و دەم
سەیری چارەی بەختی من کەن بوو بە رەنگی زەعفەران
نەوبەهاری من خەزانە سەردەمی سوبحم تەمووز
پەڕتەوی ماهە غەم و چاکی دەروونم وەک کەتان
"تورک "ی قورسی خۆر کە تالیع بوو تلووعی کرد بەرەقس
کەوکەبەی ماهی مرادی ئەهلی بابان بوو نەهان
دڵ لە میحنەت کەیلە مەیلی سەیری ناو شارم نییە
عەینی چاوم خوێنی تێزاوە لە داخی مەردمان
راستە گەردوون چابوکە بۆ رەنگی بەدرتین وەلێ
نارژینی رەنگێ بەم رەنگە بە موددەی سەد قران
ساعقە و بەرقی نەدامەت زولمەتی دا شەرق وغەرب
بەردە باړانە بە مەخسووسی لەسەر مولکی بەیان
چاوی عیبرەت هەڵبڕە ئەی دڵ لە وەزعی دەوری دوون
سەیری سا ، تورکی فەلەکچی کرد بە زومرەی کورد زەمان
شارە زوور بەحر و سولەیمانی لەسەرئەو گەمیەرەنگ
بۆ شکستی وەک نەهەنگ بۆ فیتنەیی ئاخر زەمان

بێ زبان، کوکو زنان، هەر خانەدان تێ فکرە تۆ
عەنکەبووت خواجە نشینە ، جوفتی جوغدە دیدەبان
وەک مەگەز رۆی لە لایان فەرقی پاک و پیس نەبوو
لەق لەق و نێری ئەچن بۆ زابتی نەهری موان
مەردی مەردان هاتە جەولان باز لە رەنگی تەپلی باز
حەیتە وەک شاهۆی گێژ و کورد بە میسلی باڵەبان
گوللە تۆپ وەک تۆپی قامیش بوو لە ئاقار غیرەتی
تەبعی جوویای بەزمی شللیک بوو لە جێی سینە کەمان
هەی خوا رۆ لەو دەمە چی کرد تەقەی توپ و تفەنگ؟
سەرزەمین تاریک و دنیا تۆز و کەر گوێی ئاسمان
ماهی تالیع رێی محاق و رۆژی نەگبەت جیلوەگەر
خەرمەنی شادی لەبەر با بەرقی غەم ئاتەشفشان
گەر چی پێشا پێش بە هەیبەت بوون و ئازا چوونە پێش
حەسرەتا دیسا نەیانزانی ( نظام ) وا بێ حەیان
پێش دەمی وان شللیکی تۆپ و پشتی سەریان ئاگرە
گەییە چەرخی حەوتەمین لەو عانەدا ئاه و فغان
گوێی فەلەک کەر بوو لەبەر ناڵەو نەفیری ئەهلی شار
لامەکانی گرت سەدای ناڵە و فوغان و الامان
رەنگی سەحرای مەحشەری بوو شیوەکەی لای پیرمەسوور
گرمە گرمی تۆپی رۆمی ، هەو هەوی سوارەی بەبان
بووبە جارووبی محەللە هەر تەرەف پەنجەی پەرپو
پەی کرا بێ پەی لە مەیدان پەهلەوانی پالەوان
حاکمە رۆمی لەسەر تەختی سولەیمانی دەریغ
کەوتە دەستی دێوی دوون موهری سولەیمان الامان

سالم بە گێرانەوەی هەواڵی ناوشاری سولەیمانی و کردەوەی تورکەکان و دوایە گیرانی ناوچەی حکوومەتی بەبە وا دەر-دەخا کە ئەودەم بۆ خۆی لە سلێمانی بووە و ئەم رووداو و کارەساتە مێژوویییەی بە چاوی خۆی دیتوە ، بەڵام لە باری ئەوینەوە ئەودەم کە دەست بۆ قەڵەم دەبا غەزەلێکی دیار و بەر چاو و بەتام و چێژ دەداتە دەست خوێنەر وەک دەڵێ:

دڵم شادە لە بەندی سلسلەی گیسویی دڵبەردا
لە شانە خەوف ناکا دەفعەیێ لەم داوەدڵبەردا
گرووی بەست بەدڵ لە سینەمدا لە حەسرەت سەروومیهری تۆ
کە حەتتا ئاگری پڕ گڕ ئەسووتێنێ لە مەجمەردا
تەحممول کە زەمانی کوشتنی من سورعەتی ناوێ
لەدڵمایە بگێرم خۆم بەدەوری دەست و خەنجەردا

بڕوانینە ئەو جناسە ( دڵبەردا ) و ( دڵ ) بەودا نازانم کە زمانی ئێمە بۆ جناس ئاوا خۆشە یان دەبێ ئەو شێوەیە لە زمانی دیکەشدا هەبێ و یان ئەو جناسە پێوەندی بە سەلیقەی شاعیرەوە هەیە ، بەڵێ ئەوە باسێکی تایبەتییە و پێویستی بەوەی هەیە بە وردی لەسەری بدوێین جارێ با باسەکەمان لە دەوری هەڵنەبڕین . لە باری شیرن کاری یەوە سالممان دیت و ئەو جار دەگەڕێین لە تێ هەڵکێشەکانی سالم. لێرە لەم غەزەلەدا بۆمان دەردەکەوێ کە ویستوویەتی خۆی لەگەڵ حافز هەڵسەنگێنێ .

ئەگەر ئوممێدی دڵ بێنێتە جێ ماهی جیهان ئارا
بە خال هندوش بخشم سمرقندوبخارا را
لەبن خاری موغیلان وەسڵ ئەگەر بێ‌شا رەزوور ناکەم
کنار آب رکن آباد و گل گشت مطلی را
نەسیحەت بگرە گوێ جانا! لە لایان زۆر بەتەکریمە
جوانان سعادتمند پند پیر دانا را
دو سەدجار گەر بەگوێی خۆم حەرفی‌سادەت بژنەوم شادم
جواب تلخ میزیبد لب لعل شکر خارا
ئەگەر رحۆری لەکەوسەر شوست وشۆی خۆیدا بەتۆ نابێ
بە آب و رنگ و خال و خط چەحاجت روی زیبا را
لە ئیدراکی شکەنجەی عوقدەیی زولفت پەرێشانم
کە کس نگشود و نگشاید بە حکمت این معما را
کە شوعلەی تەلعەتی یۆسف تلووعی کرد بەچی زانیم؟
کە عشق از پردهٔ عصمت برون آرد زلیخا را
کەلامت حافزا دڵ سەنجە بۆسالم وەها چاکە
کە بر نظم تو افشاند فلک عقد ثریا را

لە هەوەڵ روانینی شیعری سالمدا مەبەستێک دیاری دەدا کە جێی خۆیەتی باسی لێ بکەین . ئەویش ئەوەیە کە وشەی فارسی و عەرەبی لە شیعرەکانیدا گەلێک زۆرن رەنگە بێ دەستەیەک لایان وا بێ کە مانا و معادلی ئەو وشانەی لە کوردیدا بۆ نەدۆزراوەتەوە بەڵام بە بڕوای من ئەو سەردەمە جۆرێک بووە کە هونەریان لە تێکەڵاوی وشەدا دیتوە وهەرکەس زۆرتری وشەی فارسی و عەرەبی زانیبایە پێیان زاناتر بووە و لە لایەکی دیکەشەوە نزیکایەتی لە زمانی فارسی بە ئەر کێکی گەورە زانیوە. هەر وەک ئێستا کە ئەوە بۆتە باو و دەبێ بڵێین بە داخەوە تا رادەیەک پەرەی گرتووە و هەر کەس کە باس لە شتێک دەکا بۆوەی نیشان بدا کە زۆری خو —

ل ۶۲ ←

# عەزیزی ئالی :
# بوار

سوار بە کەناری چەمی تووڕەوە راوەستا و چاوی دەشەپۆلان بڕی . پاش قەدەرێک وە زمان هات و گوتی : " ئەی چەم ! من سوارێکم کە بە شوێن بژیویدا گەیشتوومەتە ئێرە ، کەلێکم هەوراز و لێژ و دۆڵ و دەرە هەڵبواردوە ، زۆر شەکەتم ، مەودا بدە بپەڕێمەوە ! "

چەمی کەف چڕێنی سوور هەڵگەڕا و دەینەڕاند کە : " سوارۆ تا ئێستا ئەوەی و بە هەویا بوە غوروورم بشکێنێ و وەناوم بکەوێ ، ئاومالکی ناویم بەرەو مەڵبەندی فەراموشی راما ـ لێوە . سوارۆ ! خۆ لە چەپۆکی شەپۆلم لادە و بگەڕێوە کە بێ بوارم . "

سوار لەبەر خۆوە گوتی : وا دیارە قسەی نەرمی بەگوێدا ناچێ. پاشان رووی کردەوە چەم : " ئەی بێبەزە ! بە هەڕەشەت نابەزم کە شۆڕە سوارێکی بوێرم ، ئەگەر بواریشم نەدەی هەر لێدەدەم . جا چۆن دڵی من بە کوڕژن و کەفی تۆ دادەخورپێ ؟! جا چۆن لە شەپۆل و کەفی تۆ دەپرینگێمەوە؟ ، ئەوجار رووی لە ئەسپەکەی نا ، دەستێکی بە یاڵ و بژیدا هێنا و گوتی : " بۆرە خۆشبەزەکەم ! ئەسپی با و بۆرانم! حدوودەکەم ! تا ئێستا گەلێکت گەلی و یاڵ و ملە و زینوو بە زەبری نالان خستوەتە نالێن ! ئیمڕۆش لەم رووبارە بە فیشالە مەڕەوێوە و لێدە . ئەسپ سەری هەڵتەکاند و دەستی کرد بە کوڕژن و سەرکێشی . وادیار بوو دەڵێ قسەکانت راستن بەڵام هی ئەم جارە گەلێ چەتوون و بە سامە . ئەم چەمەی من دەیبینم ئەسپ سەهلە ، کلێ پردیش هەڵدەتەکێنێ. چاکتر وایە وازبێنی .

بەڵام سوار بواری ئەسپی نەدا و جڵەوی لێ شل کردو ئاوزەنگی کوت وەناو ئاوی خست . ئەسپ تا نێرینەی چەمەکە رۆیشت بەڵام سمی بە بەردی ئاوەسووی بەستۆرەکەوە گیر نەبوو لە ناکاو سەرەنگرێ بوو ، سوار خۆی پێ نەگیرا و تێکەوت . وە مەرگە مەلە کەوت ئەمما تازە تەوژمی بێ ئامانی چۆم هەوساری ئیختیاری لە دەستی دەرێنا بوو ،چۆم لوولی دا ، رایڕفاند پاشان بناوی کرد ....

ئەسپ خۆی لە چنگی شەپۆلان راپسکاند و هاتە دەر. ئەسپ چاوی دە ئاوەکە بڕی بەڵام سوارەکەی ئاسەواریشی نەمابوو. ئەسپ گوێی هەڵخست بەڵام لە قاقای بەسامی چۆم بەدەر چی نەبیست! ئەسپ خۆی راتلەکاند و ئاوی بەدەنی بەم لا و لا دا هەڵپرژاند پاشان وەرگەڕا وسەری داخست و بەباری گرانی کەسەرەوە کەوتە رێ ، خرمەی نالەکانی بۆنی بەهی ، بۆنی شین و شەپۆڕ ، بۆنی فەراموشی لێدەهات!

# بەهار

خوالێ خۆشبوو مەلا عبدالکریمی سائیب ازاری

نەسیمی باغی خەلدە یا شەمیمی زولفی‌یارە دێ
عەبیری میشکی چینە یا بەشیری نەوبەهارە دێ
هەور لە ئاسمانەوە مەئمووری کردگارە دێ
عوشاقی ئەشکبارە یا " خضر " لە کۆهسارە دێ

موژدەی زوهووری تەلعەتی جەمالی لالەزارە دێ
دەنگی شەماڵە کەڕ دەکا دڵێرەکانی بەهمەنی
گوڵاوی هەورە تەڕ دەکا رووبەندی بووکی گوڵشەنی
بیژەن خوڕان دەدا لە یەخ بە گورزی‌قورسی‌سەدمەنی
گەهێ لەسەر گەهێ لەبەر گەهێ لەپا دەدا مەنی

لە بۆ شەڕی دێوە سپی روستەمی نامدارە دێ
هەوری سیاهی توند خوولەگەڵ شەماڵی دووبەدوو
بە ناڵەناڵ و هاو هوو بەدەست و برد وهات و چوو
عازمی رەزمە زوو بە زوو بەگرمەگرم و قاو وقوو
سپای زسانی قڕ ئەکا لە تیلەکۆ لە هۆبەتوو

بە تانگ و تۆپ و تیپەوە، خوسرەوی تاجدارە.دێ
لە داخی جەوری پایز و زوڵمی زسانی پڕ ستەم
لە ئەندەروونی هەورەوە کە دێ شەرارە دەم بەدەم
لەوانەیە کە کێوەکان بەیەک کەڕەت ببن بە شەم
عەجەب نیە بخۆمەوە بۆ دەفعی ئێش و دەرد و خەم

بە کووپەوە بە کوندە لەو شەرابە خوشگەوارە دێ
بادی سەبا تەم و مژی زسانی تار و مار ئەکا
هەوا موعەتتەر و چەمەن بە غونچە میشکبار ئەکا
" مشاطە وار " ئارایشی بوتانی کۆهسار ئەکا
سپی و سوور و سەوز و رەش بەنەقشی سەدهەزار ئەکا

تەلی جەنابی مانی یە نەقاشی کردگارە دێ
قەترە کە دێتە سەر زەوی لە هەوری دوڕ فشانەوە
شیوەن ئەگاتە ئاسمان بە ناڵە و فەغانەوە
لە "چل چەمە "لە "کۆتەڕەش"لە "گردەکۆ "لە "خانەوە "
لە "سێوەسوور "لە "پیربوداق"لە "کورتەک"و "بەیانەوە"

بۆ قەتڵی خەیبەری وەکوو سوپاهی زولفەقارە دێ
لە بەینی هەورەوە ئەگەر شوعاعی رۆژێ دێتە دەر
خەنجەرە بۆ بڕینی سڕ، نێزەیە بۆ سک و جگەر
کلیلەکانی موعتەبەر، بەفر و سەهۆڵێ پڕ خەتەر
لەشار ودێ لەدەشت و دەر لەهەردو کێو و راگوزەر

بە دەست و برد و حەملەوەر نەورۆزی نێزە دارە دێ
صورتگرانی ئەکبەری و هەزارە نەقشی دڵبەری
لەسەر گوڵووکی ئازەری سیە، سفید و ئەحمەری
" بنفشەای " و " اصفری " چە قهوەای چە " اخضری،
"مثلثی" ، "مدوّری " " مخمّسی " " معشّری"

تەرتیب ئەدەن نە سەرسەری ، بە فیز و اعتبارەدێ

جەمالی ڕۆژی شوعلەوەر وەکوو عەرووسی مونتەزەر
چادر فڕێ دەدا لەسەر یانی لە پەردە هاتە دەر
شوعلەی ولاتی گرتە بەر لەباغی کردی دەر بە دەر
بوومی زسانی بەدگوهەر زاغی خەزانی بەد سیەر

لە ئاسمانی چوارەمین مەسیحە روو بە خوارە دێ

لە لانکی ، زەمینەدا پەروەرشی منالٚ ئەدا
تەرتیبی رووومەت ولەب و پەرچەمو زولف وخالٚ ئەدا
وەسمە لە تاقی ئەبرۆ و سورمە لەچاوی کالٚ ئەدا
بە تازە بووکی کانی گولٚ ختووتی شین وئالٚ ئەدا

پێخەسوویەکی ماهیرە ئەم هەورە عەترە بارە دێ

راز و نیازی بولبول و شکۆفەکانی میشک بۆ
بەزمی شەهێن وقومری و سەرو وچناری لێوی جۆ
لالە لە مێرغوزارەدا حکوومەتێکی سەر بەخۆ
بۆ " انتظام "ی گولٚستانِ نەسیمی دێ سەبای ئەڕۆ

سەمەن لەنێو شکۆفەدا مەهی نیقابدارە دێ

ئارایشی چەمەن کرا لە سەبزە فەرش راخرا
حەیاتی تازە بەخشرا غەمی فیراق وەلا برا
دوکانی غەمزە دانرا نەویدی وەسلٚی گولٚ درا
چراغی عیشوە هەلٚکرا نەیەک چرا نە سەد چرا

بۆ قەسری میسری دلٚبەری یۆسفی گولٚعوزارە دێ

ساقی بە جامی بادەوە بە زولفی تابدادەوە
بە خاکی میشک زادەوە ، بە تەلعەتێکی سادەوە
لە بورجی شاهزادەوە بە ئەبرۆیی گوشادەوە
بە داوی مەشکی سادەوە بە گەردنی بێجادەوە

بە جادەوە بە بادەوە زینەت و لالەزارە دێ

پەڕەندەکانی خۆش نەوا بە سەد نەوایی زارەوە
بە نالٚەیی دەف و نەی و بەچەنگ و عوود و تارەوە
بولبول لە سەحنی گولٚشەن و قومری لە شاخسارەوە
ئاوازە خوێنە هەر یەکێ بە یاد و شەوقی یارەوە

سەدای بەزم و عیشرەت و بۆنی بەنەفشەزارە دێ

غونچە بە پێکەنینەوە بە بەرگی زەرد و شینەوە
بە عەتر و میشکی چینەوە بە پەڕتەوی جەبینەوە
بە عیشوەیێکی دلٚگوشا بە رووی نازەنینەوە
بە چاوی مەست و خالٚی رەش بە پەرچەمی چینچینەوە

ئافەتی گیان و خاتری بولبولی بێقەرارە دێ

لالە لە ژێری خاکەوە خەیمە بە سەبزە زار ئەبا
بۆ شاهیدانی گولٚ سەبا خەلاتی زێڕ نیگار ئەبا
وەنەوشە گەردنی کەچە سوجدە بۆ خالٚی یار ئەبا
هەزار عیشوە گولٚ لە گەلٚ هەزارەدا بەکار ئەبا

زەمانی وەسلٚ و دەولٚەتی دیداری خەمگوسارە دێ

گولاٚلٚە سوورە هاتە دەر لە گونبەدی زەبەڕجەدی
لیباسی سۆسەنی دوروو خەیاتی سەنعی ئیزەدی
خولاسە داری بێ گەلاٚ ، لە رەحمەتی موجەڕڕەدی
عەتا کرا بە کێو و دەشت زۆرخەلعەتی زومورڕوودی

هەوا بە میهر ومەرحەمەت حەکیمی دەردەدارە دێ

نەرگسی پڕ خومارە دێ سونبلی تابدارە دێ
سوسەنی ئابدارە دێ لالەیی داغدارە دێ
بەهارە دێ نیگارە دێ حەیاتی گیا و دارە دێ
( زاری ) مەلێ بەهارە دێ قودرەتی کردگارە دێ

ئەشعاری ئابداری تۆ بە یادی چاوی یارە دێ

# جوغرافیای تەبیعی کوردستانی

## جوغرافیای کوردستان بەشی یەکەم ئێران

شەمیم هەمەدانی
وەرگێر: ع. ا. زەبیحی

دەمانەوێ لە هەر ژمارەیەکی گۆوارەکەماندا باسێکی جوغرافیایی کوردستان پێشکەش بکەین. بەختەوەرانە دەگەڵ ئەوەشدا بۆ سەرچاوە زۆر داماو نەبووین و نووسراوەی عەرەبی و فارسی باشمان لە دەس دابوون. برا و خوشکە خوشەویستەکانمان لە بارەی شار و مەڵبەندی ژیانی خۆیان باسی جوغرافیایی باشیان بۆ ناردوین. پڕ بە دڵ سوپاسیان دەکەین. بەڵام کوردێکی دڵسۆز بە خەتی خۆی نوسخەیەکی لە جوغرافیای ماموستا شەمیمی هەمەدانی بۆ ناردوین کە ماموستای بە ناو بانگ و قامووس نووسی بێ وێنە و زانای بێ سەر و شوێنی کورد ماموستا زەبیحی وەری گێڕاوەتە سەر کوردی ئێمە بە پێویستمان زانی لە یەکەم ژمارەدا ئەو باسە چاپ بکەین. چونکە هەم باسەکە کوللی یە و هەم هەڵەکانی راست کراونەتەوە و هەم یادگاری زانایەکی کوردیشە کە کەس لە چارەنووس و دوا رۆژی هەواڵێکی تەواوی نیە و ئەگەر هەشیبێ وەک رازێک لە لای خۆی رایگرتوە.

هیوا دارین هەر کوردێک لە هەر جێگایەکی وڵاتەکەمان دەژی و دەستی قەڵەم دەگرێ جوغرافیای شوێنی دانیشتنی خۆی چ شار، چ دێ، بۆمان بنووسێ کە خوا یار بێ بەرە بەرە چاپیان بکەین. تا وڵاتەکەمان باشتر بناسین. زۆر کەس رەنگە کەمتری دەگەڵ چاپەمەنی سەر و کار هەبووبێ. لە بەر ئەوە تەوەزەلی بکا. بەڵام ئێمە بۆمان دەرکەوتووە، جاری وایە شتی زۆر باش لە بەر دەستی کەسێکی وا دەرکەوتوە کە شارەزایی و ئەزموونی خۆی بە تاقی نەکردۆتەوە. بێباکانە بنووسن، سادە بنووسن، چ بوو ئەگەر جارێکی وەبەر دڵان نەکەوت، جارێکی دیکە لە سەرچاو دادەنرێ.

مەبەستی نووسەر لە دانانی ئەو کتێبە روونکردنەوەی جووغرافیای مەڵبەندی کوردستان و دیاری کردنی رەگەزی راستەقینەی هۆزەکانی کورد و مێژووی سیاسی ئەوانە، بۆ ئەم مەبەستە نووسەر پشتی بە ئەنجامی لێکۆڵینەوە و بە شوێنیدا گەڕانی زانایانی فەرەنگی و هەیئەتە زانستی‌یەکان بەستوە کە پەیتا پەیتا هاتوونەتە ئێران و لێکۆڵینەوەکانی خۆیان خستۆتە سەر کاغەز.

بۆ بەرپەرچدانەوەی بیر و باوەڕ و باری سەرنجی کۆمەڵێ لەو کەسانەی کە بە نیازێکەوە دەستیان داوەتە لێکۆڵینەوە و بیروباوەڕ و ئامانجی سیاسی دەوڵەتەکانی خۆیان هەمیشەو لە هەموو جێگایەک، کردۆتە ناوئاخنی وتەی زانستی و بە ناوی زانست و زانین لە گەڵێ وڵاتی رۆژهەڵات لە سیاسەتی ئیستیعماری دەوڵەتانی خاوەن قازانج پەیڕەوی یان کردوە، هەروەها بۆ ئیسبات کردنی ئەو مەبەستە کە هۆزەکانی کورد ئێرانین (چونکوو هێندێ لەو کەسانەی بە نیازێکی سیاسی دەستیان داوەتە لێکۆڵینەوە، دەڵێن کورد هیچ پێوەندێکی رەگەزی یان لە گەڵ ئێرانیان نیە) هەموو نووسراوەکانی مێژوو نووسانی کۆن و مێژوو زان و جوغرافیا نووسانی ئیسلام و ئەنسیکلۆپێدیای ئینگلیزی و فەڕەنسیم بە وردی خوێندۆتەوە و وێڕای روون کردنەوەی رەگەزی کوردان درۆ و ناڕاستی قسەی ئەو موحەقیقانەشم بە ئیسپات گەیاندوە.

چوونکو من لەو جورە باسانەدا، بێلایەنی و خوێن ساردیم پێ لە تەعەسوبی نەتەوایەتی باشترە، ئەوەندەی بۆم کراوە هەوڵم داوە راستی ئاشکرا بکەم تا خوێنەرانی بەڕێز نەمکەنە ئامانجی سەرکۆنە وتانووت و بە (واعظ)ێکم دانەنێن کە بە قسەی خۆی ناکا. (شەمیم)ی هەمەدانی

## جوغرافیای کوردستان بە گشتی و بەشەکانی

کوردستان لە باری رەگەزی یەوە مەڵبەندێکی پان و بەرینە کە سنووری باکوری وی جنووبی فەلاتی ئەرمەنستانە و سنووری جنووبیشی دەرەی چۆمی (دیالە) یە کە یەکێکە لە لق و پۆپەکانی دەجلە. درێژایی کوردستان لە جنووبی رۆژهەڵاتەوە بۆ باکووری رۆژ ئاوا ٦٠٠ – ١٠٠٠ کیلومیترە و پانایيشی ١٢٠ – ٤٠٠ کیلومیترە و تا ٤٨ دەرەجەی رۆژهەڵاتی گرینویچ راکشاوە. ئەم مەڵبەندە بەفراوانە کە بابەتە جۆر –

بە جۆرەكانی جوغرافیایی: چیای سەخت و رژد، بانووی بەرز، دەشتی بە پیت و بەرەكەت، چەم و رووباری زۆر و دیمەنی تەبیعی یە، لە نێوان سێ دەوڵەتی، ئێران و عێراق و توركیادا بەش كراوە.

## كوردستانی ئێران

سنووری تەبیعی: كوردستانی ئێران (۱) بانوویەكی بەرزە لە رۆژئاوای ئێران، لە باكوورەوە بە بانی ئازربایەجان و دەراوی دەریاچەی ورمێوە نووساوە، وەڵاتی هەمەدان و خاكی هەوشار دەكەونە لای رۆژهەڵاتی دەرەی چۆمی دیالە لە جنووبیدا هەڵكەوتوە، لە لای رۆژئاوای سنووری تەبیعی نێوان ئەم بانوە و جولگەی میزوپوتامیا (عێراق) دەرەی چۆمی دەجلەیە (۲)، شاخی بەرز كەبەشێكیان كلكەی چیاكانی ئەرمەنستانن و بەشێكیشیان زنجیرەی چەند لیزگەی زاگرۆسن، رووی فەلاتەكەیان داپۆشیوە. ئەو چیایانە سەرچاوەی گەلێ چەمن كە لە رۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا یا لە جنووبەوە بۆ باكوور دەچن. لە باری شكڵ و لای راكشانی چیاكان وچلۆنایەتی رۆیشتنی ئاوی چۆمەكانیشەوە كوردستان دەكەینە سێ بەشی جیاواز.

### ۱ - كوردستانی موكری و گەرووس:

باری درێژ بوونەوە و راكشانی شاخەكانی كوردستان، بە شێوەیەكی گشتی وێرای شاخەكانی زاگرۆس لە باكووری رۆژئاواوە بەرەو جنووبی رۆژ هەڵاتە.

ئەو زنجیرە شاخانە كە لەگەڵ زنجیرەی زاگرۆس لە ناوەوەی فەلات راكشاون بە هۆی دەراوی چۆمان لێك دادەبرین. چیاكانی رۆژئاوای كوردستان كە سنووری تەبیعی و سیاسی ئێران پێكدێنن زنجیرەی موازین و لووتكەی رێك و پێكیان هەیە. باری لێژیان لە جنووبەوە بۆ باكوورە و فەلاتی ئێرا ـ نیان وا لێ كردوە كە بەسەر جولگەی میزوپوتامیادا بروانێ، ئەملێژییەمان لە رۆژئاوا بەرووكاری میزوپوتامیادا رژد و لەلای رۆژهەڵاتلە سەر خۆیە بەرزایی مام ناوەندی چیاكان دەگاتە ۳۲۰۰ كیلومیتر. لووتكە گرینگەكانی ئەم زنجیرەیە كە دەكەونە نێوان وڵاتی شنۆیە و دەربەندی بە ناوبانگی ئالان بریتین لە: چیا رەش، كێوە سپی، چیای بەرزەن، چیای كانی خولا،قەندیل، چیای باقر و چیای حاجی برایم (۳) ئەم كیوانە بەشی زۆری ساڵ بەفر داپیۆشیون.

لە نێوان ملەی كێلە شین ودەربەندی ئالان زنجیرەی چیاكانی سنوور رێك و پێكن و لە باكووری رۆژئاواوە بۆ جنووبی رۆژ هەڵات درێژ دەبنەوەوبارییان لەگەڵ باری چیاكانی جنووبی رۆژئاوای ئێران موازی هەڵكەوتوە.

ئەم زنجیرەیە سنوورێكە چیا ئاگر پژێنە نارێكەكانی ئەرمەنستان و ئارارات لە كێوە رسووبی یەكانی (۴) زەهاو، و لورستان لێك جیا دەكاتەوە.

لە رۆژ هەڵاتی موكریان دوو زنجیرە كێو یەكێك بەناوی (بەردەسیر) و (۵) ئەویتر زنجیرەی موكریان لەگەڵ یەكتر موازی هەڵكەوتوون و دەراوی چۆمی جەغەتوو لێكیان دادەبڕێ و درێژەی چیای بەردە سیریش لە باكوور بە هۆی دەراوی چۆمی تەتەهوو هەڵبڕاوە.

كلكەی ئەم زنجیرەیە بە ناوی كورتەك تا سابڵاغ و جنووبی دەریاچەی ورمێ دەكشێ.

باری درێژەی كێوەكانی بەردەسیر لە باكووری رۆژئاواوە بەرەو جنووبی رۆژ-هەڵاتە و تۆزێك بۆ لای رۆژهەڵات لار دەبێتەوە، بە راستی ئەم زنجیرەیە ئەو سنوورەیە كە لەلای رۆژهەڵاتەوە كوردستان دیار دەكا و ئاوڕێژگەی كوردستانیشە دامانەی لای رۆژهەڵاتی بە لێژایی یەكی لە سەرەخۆ و بڵیندلە دەراوی چۆمی جەغەتوو دەبڕێتەوە و لە رۆژئاواشی دەراوی (زێ)یە هەڵكەوتوە لووتكە گرینگەكانی ئەمانەن: شوان بریان، پالانسەر، شیرینتان، كورتەك، كێوی یاقووب ئاغا، ملەی كێلە شین كە لە دەربەندە گرینگەكانی ئەم مەڵبەندەیە بۆ لای رۆژئاوا لەزنجیرەی بەردە سووردا هەڵكەوتوە.

كێوەكانی ناوەوەی موكریا روگەرووس

---

۱ - ئەگەر چی دانەری كتێب لە پێشەكی یەكەیدا دەڵێ كوردستان لە نێوان ئێران و عێراق و توركیادا بەش كراوە، بەڵام لەباسی "كوردستانی ئێران"دا مەبەستی تەنیا كوردستانی سنەیە.

۲ - ئێستا سنووری سیاسی نێو كوردستانی ئێران و خاكی عێراقی عەرەب دولمین بەرزایی لای رۆژئاوای زنجیرە شاخەكانی زاگرۆسە و ئەوسنوورە بە پێی پەیمانێكی سیاسی نێوان دوو دەوڵەت قەرار دراوە.

۳ - دانەر وشەی (داغ)ی توركی بە دوای ناوی ئەم چیایانەوە نووساندووە كە لە سەرچاوە عوسمانی یەكانەوەی وەرگرتووە. لەبەر ئەوەی ناوی چیاكان لە ناوچەی خۆیاندا بێ (داغ) بەكار دەهێنرێن ئێمەش لێرەدا لامان بردن.

۴- رسووبی ئەو كێوانەن لە نیشتنی قوڕو لیقەی ناو ئاو پەیدا بوون.

۵ - رەنگبێ راستی یەكەی (بەردە سوور) بێ.

کلکەی هەڵقرچاوی یەکانی زنجیرەی بەردە سیرن کە بە هەموو لایەکی ناو فەلاتەکەدا لق و پۆپی لێ بۆتەوە و رادەکشێن. لووتکە گرینگەکانی ئەمانە کێوی تەکەلوو کەدەراوی چۆمیجەغەتوو لە چەمی سەقز (ئەویش لقێکی جەغەتووە) جیا دەکاتەوە، کێوی وەنەوش لەنێوان چەمی خالۆ و چومی تەتەهوو.

بە پێی ئەم سەرەتایانە دەتوانین کێوەکانی کوردستانی موکریان بکەینە دوو بەش، یەکێ چیاکانی مەزنە کە لە باکوور و باکووری رۆژئاوا بەرەو جنووب و جنووبی رۆژهەڵات درێژبۆتەوە و بەشێکە لە چیا سەرەکی یەکانی فەلاتی ئێران و بە شێوەیەکی گشتی لووتکەکانی رێک و پێک و باریراکشانی ئاشکرایە، دەستەکەی دیکە هەڵقرچاوی دەرجە دوون کە باری هەڵکەوتنی چیا ـ کانیان بەلای رۆژهەلات ـ رۆژئاوادا وەرچەرخاندوە و دیسان تەوژمی قورسی ئاگرپژێنی سەهەند و ئالّ و گۆڕی زەوی کاری تێکردوون و باری هەڵکەوتنی دووەمیشیان تووشی گۆڕان هاتوە.

## چۆمەکانیموکریان و گەڕووس(بیجار):

لە کوردستانی موکریان و گەڕووسدا دوو مەڵبەندی بەر چاو بۆ باری جاری بوونی ئاوەکان دەتوانین دیاری بکەین یەکیان هەرێمی باکووری رۆژهەڵاتە کە چۆمە گرینگەکانی بریتین لە :جەغەتوو و تەتەهوو، ئەویتر بەشی جنووبی رۆژئاوا یا دەراوی (زێ)یە بچووک (کەڵوێ)یە، چۆمەکانی موکریان لە بەر باری هەڵکەوتنی شاخەکانی وچلۆنایەتی بەرزی و نزمی زەوی بەدوو لای باکوور و جنووبی رۆژئاوادا دەڕۆن، چۆمەکانی باکوور دەڕژێنە دەریاچەی ورمێ و چەمەکانی جنووبی رۆژئاواش بە هۆی (زێ)ی بچووکەوە تێکەڵ بە دەجلە دەبن.

## دەراوی ورمێ:

چونکوو سەرچاوەی چۆمەکانی ئەم دەراوە لە چیا پڕ بەفرەکانی بەردەسیر و چل چەشمەدا هەڵکەوتوە، چەمەکانی بەنیسبەتئاویان زۆرە و لە بەرئەوەش کەبەستوورەیان لە زەوی خوێڵێندا نیە ئاویان شیرینە و گرینگ ترینیان جەغەتوو و تەتەهووە.

## جەغەتوو یا زێڕین چۆم: (٦)

بە درێژایی ٢٤٠ کیلومیتر (نیزیکەی ٣٧ فەرسەق) لە کێوی چل چەشمە هەڵدەقولێ و لە جنووبەوە بۆ باکووری جاری دەبێ، لای ژوورەوەی چۆمی خورخوڕەی پێ دەگوترێ .گرینگ ترین لقەکانی لە لای چەپی چەمی سەقزە کە لەکێوەکانی بەردەسیرەوە دێت و مەڵبەندی سەقز پاراو دەکا و لەو جێگایەی کە دەڕژێتە ناو جەغەتوو پان دەبێ، چومی جەغەتوو لەو شوێنەوە کە چەمی سەقزی تێکەڵ دەبێ تا ئەو جێگایەی خۆی دەڕژێتەناو دەریاچەوە لقێکی گرینگی نیە، بەلام لە لای راستەوە هەموو ئاوەکانی چیای کانی خولا و ساروی دەڕژێتە ناو. لقی دیکەش بە ناوی لەیلان و ساروّخ لە داوینەی سەهەند و خاکی هەوشارەوەدێن و لە نیزیکی (مەصەب)ە وە تێکەڵی دەبن.

ئاوی ئەو چۆمە شیرینە و بۆ کشت و کاڵ کەلکی لێ وەردەگیرێ، بەلام لە بەشی موکریان لە بەر بڵیندی زەوییەکانی قەراغی و قووڵایی زۆری چۆمەکە کەلک وەرگرتن لە ئاو دژوارە وزۆربەی ئاوی ئەم چەمە مەزراکانی مەڵبەندی سابێن قەلا دەیخۆنەوە.

## تەتەهوو:

ئەم چۆمە لە جەغەتوو کورتتر وکەم ئاوتریشە، بە دەروێکی قووڵدا دێتە خوار کە زنجیرەی چیای کورتەک وبەردە سیر لێک دادەبڕی، لقەکانی لە لای راستەوە چەمی خاڵۆیە و لە دەستی چەپیشەوە چۆمی سابلاغ و (٧) چەند رووباری بچووکن کە لە نیزیکی دواوانە کەیەوە تێکەڵی دەبن. چۆمی جەغەتوو و تەتەهوو لە بەر ئەوەی ئاوەکەیان شیرینە و (خوێ و املاح)ی تێدا نیە ماسی یان زۆرە، بەلام چونکوو خەڵکی دەوروبەریان گوێ نادەنە راوە ماسی و ئامرازی پێویستی ئەم کارەش نیە کەلکیان لێ وەر ناگیرێ.

## دەراوی دەجلە:

ئاوەکانی بەشی جنووبی رۆژئاوای موکریان کە لە چەند چیا یەک سەر چاوە دەگرن، تێکەل یەک دەبنەوە و چۆمی (زێی کچکە) یا (کەڵوێ) پێک دێنن (٨)، لقی پڕ ئاوی (زێی بچووک) لە پێشدا لە شاخی مەیدان (٩) بە بەرزایی ٢١٤٠ گەز سەرچاوە دەگرێ،

---

٦ ـ ناوی ئەم چەمە لە کۆنەوە (جەغەتوو) مەشهوورە. پاشان ئەم ناوە مەغوولیە کرا بە فارسی و بوو بە (زرینە رود) کە بە کوردی دەبێتە (زێڕن چۆم).

٧ ـ سابلاغ تەحریفیکی ساوج بولاق و بە مانای (چۆمی کانی سارد)ە.

٨ ـ دانەری کتێب بە سەهو چوە و ناوی (زێی کچکە) وەختێک پەیدا دەبێ کە هەموو ئەو ئاوانە دەگەنە خاکی کوردستانی عێراق.

٩ ـ مەیدان بەڵەک لە چەند کیلومیتری رۆژئاوای مەهاباده.

لەم جێگەیەدا لە بەر ئەوەی شاخی (لکبن) کە ١٥٦٠ گەز بەرزە و لە لای چەپی دەرەی سەرووی هەڵکەوتوە پێشی دەڵێن (چۆمی لکبنێ) و پاش ئەوەی بە دامێنی ئەم کێوەدا دەڕوا، بۆ لای جنووبا دەداتەوە و بە دەرەیەکی پان و بەریندا جاری دەبێ و دەچێتە وڵاتی سەردەشت، لە هەریمی سەردەشتدا کەبە مام ناوەندی هەزار گەز بەرزە، نشیوی چۆمی کەڵوێ زۆر خوڕە و لە مەودای ١٦ فەرسەقدا نیزیکەی ٥٦٠ گەز دادەکەوێ و (١٠) پاش هەرێمی سەردەشت (زێ) دیسان روودەکاتەوە رۆژئاوا و بە چیا گەورەکانی دەربەندی ئالان و (١١) جنووبی کاولەکانی شاری قەدیمی ئەربیلدا کە بە کوردی پێی دەڵێن هەولێر تێ دەپەڕێ و تێکەڵ بە دەجلە دەبێتەوە (١٢). لقە گرینگەکانی (کەڵوێ) لە لای چەپەوە چۆمی (پەسئاوە (١٣)) و چۆمی (لاوێن) و چۆمی (مسین) ە لە گەڵ چەند رووباری بچووکتر کە لە شاخەکانی تورکیا دێنە خوار، لەلای راستیشەوە لقی گرینگی چۆمی (بانە) یە کە پاش پاراو کردنی (بانە) لە نیزیکی سەردەشت وباکووری دەربەندی ئالان تێکەڵ بە (زێ) دەبێتەوە. لە هەر دوو لای دەراوی ژووروی چۆمی (زێ) یە دوو زنجیرە شاخی بڵیند هەن و ئەو چۆمە، شوێنە نەوییەکانی ئەم کێوانەی شوشتۆتەوە و لەگەڵ خۆی بردوونی و لە دوڵێکی نێوان هەر دوو زنجیرەدا پەستاوتوونی و سەر لە نوێ لە ناو ئەو شوێنەدا رێبازێکی بۆخۆی کردۆتەوە. لە بەشی ناوەڕاستدا بەستووەرەی پانتر و رەوتی مەندترە و لەم دەراوەدا کە ئاوی شاخەکان دەڕژێتە (زێ) یەوە. دەشتێکی پان و بەرینی رسووبی زۆر بە حاسڵی پێک هێناوە کە لە مەڵبەندە بە پیت و بەرەکەتەکانی موکریان حیساب دەکرێ.

## ب ـ کوردستانی کرماشان:*

سنووری تەبیعی کرماشان لە لای باکوورەوە زنجیرە شاخێکە کە دەراوی چۆمی دیالە لە دەرووی چۆمی گاماسب جیا دەکاتەوە، لە رۆژهەڵات شاخەکانی (کەنگاوەر) و لای راستی چۆمی گاماساوە و لە جنوبەوە ئەو کێوانەن کە دەکەونە نێوان دوو مەڵبەندی (کەڵوور) و (پشتکۆ) و لەرۆژئاوەاش دەراوی چۆمی دەجلە سنووری تەبیعی کرماشانە. شاخەکانی کرماشان بە پێچەوانەی کێوەکانی موکریان چونکوو تووشی ئینقیلاباتی زەوی و هەڵقرچان نەبوون و شکستی تازەیان نەهێناوە، لووتکەکانیان رێک و پێک و باری درێژ راکشانیان تایبەتی و قەرار دادەیە، بە گشتی لەباکووری رۆژئاواوە بۆ جنووبی رۆژهەڵاتوا کشاون زنجیرە گرینگەکانی ئەم چیایانە لە رۆژئاواوە بۆ رۆژهەڵات ئەمانەن:

دەلاقانی (١٤)، پەڕۆ (١٥)، هۆڵانە کە لە جنووبەوە بە کێوە سپییەوە دەنووسێ، کەللە، کێوی پەڕ قرمز، ئەم کێوانە بە شێوەیەکی گشتی بەرزاییان کەمە و رێک وپێکن، پاش ئەم زنجیرانەی باسمان کردکێوی دالەهۆ وبالۆول هەڵکەوتوون. ناوی زاگرۆس ئەگەر چی جارجارە بە هەموو زنجیرە چیاکانی رۆژئاوای ئێران دەگوترێ بەڵام ئەوی راست بێ یوونانییەکان لەو ناوە بە تایبەتی مەبەستیان کێوانی دالەهۆ و بالۆول بوە و ئەو دوو زنجیرە کە هەر لە کۆنەوە سەرنجی خێڵە ئێرانییەکان بوون، یوونانییەکانیش ناسیویانن. بێجگە لەو دوو زنجیرەیە چەند زنجیرەیەکی کەم بەرزایی وەکوو (کیالوو) و (ئەوا) و (سونبلە) و (شاکۆ) لە سنووری ئێران و عێراق و تورکیا (١٦)

ل ٧١ ←

دیمەنێک لە چۆم و سەددی مەهاباد

---

* لە سەردەمێکدا ئەم نامیلکە نووسراوە، هێشتا ناوی کرماشان نەگۆڕاوەو نەبۆتە باختەران.

١٠ـ هەر لەبەر ئەمخورییە لەم مەڵبەندەدا پێی دەڵێن (گافرێن).

١١ـ دەربەندی ئالان لە دوایی ئەو کێوانەدا هەڵکەوتوە کە لە ئێرانەوە چوونە ناو خاکی عێراق و رێگای پێوەندی کوردستانی موکریانە لەگەڵ موسڵ، ئەم دەربەندە کە چۆمی (زێی بچووک)ی پێدا دەرباز دەبێ هەر لە کۆنەوە رێبازی خێڵەکۆچەرەکان و زۆر بە ناوبانگ و گرینگ بوە.

١٢ـ ئەم زانیارییانەی کە دانەر بۆ رێبازی(زێ)ی باس کردوون زۆر شاشن

١٣ـ پەسئاوا: تەحریفی پەزئاوایە لە دوو وشەی پەز بە مانای مێگەلەمەڕ و ئاوا بە مانای ئاوەدان کەرەوە پێک هاتوە.

١٤ـ دەلاقانی، رەنگە (دڵ قانی) بە مانای کێوی دڵ خوێن بێ و لەبەر ئەوەی خاکەکەی گڵە سوورە وای پێ گوتراوە

١٥ـ بەردە نووسی بەناوبانگی داریووشی گەورە کە بە خەتی پەهلەوی باسی سەرکەوتنەکانی ئەو پاتشایەی تێدا نووسراوە لە داوێنەی کێوی (بەڕۆ) یە.

١٦ـ لام وایە لێرەدا نووسەر بە سەهو چوە چونکوو کە باس باسی شاخ و چیای کرماشان بێ هەر سنووری ئێران و عێراق دێتە مەیدان. جا نازانم ئەگەر ئەم کێوانەی باسیان دەکا کێوەکانی لای (مەرگەوەر) ئەبن. دژواری دۆزینەوە لەوەدایە کە ئەم جۆرە نووسەرانە ناوی جێگا و شاخ و ... وەردەگێڕنە سەر فارسی و... ناسینەوەیان بۆ یەکێکی شارەزای مەڵبەندەکە نەبێ زۆر دژوارە.

# بەهار

مامۆستا خاڵە مین - بەرزنجی

گوڵ و موڵان دەپشکوێنێ
ڕەنگی جۆراوجۆر دەنوێنێ

کانی وشک دەجمێنێ
کۆتر جووت بوو و دەگمێنێ

جریوە جریوی جۆلەکانە
قاڕەی سێیە و پۆلەکانە

ماڵاتی وە سەما دەخا
کوڕ و کیژ وە تەما دەخا

هەرچەند بڵێی هەوا خۆشە
لەسەر کانیان نۆشا نۆشە

لە زەنوێران هەڵپەڕینە
بە برۆیان تێک ڕا خوڕینە

ئەوەی نەتدیوە دەی بینی
هەر شادییە و خۆ نوێنی

ئاڵەکۆک سەر وەدەر دەنێ
گەزیزە پێی پێدەکەنێ

تەیر لە گەرمێنێ دێنەوە
لە چۆمەلان دەسێنەوە

ئاوهەڵدێر گوێیان کەڕدەکا
ئی هێدیش فێری شەڕ دەکا

شەماڵ بە هەڵمەت هاتەوە
داران ئاوس دەکاتەوە

کێوی لە کولێنان سەر کەوتن
گۆپاڵیان لە خیز دەرکەوتن

بولبول دڵی چڵان دەدا
دڵی بە چەند گوڵان بدا

زەردەی تاوێ بۆوا جوانە
لەسەر پەلکی ئەو گوڵانە

ڕێواس و کارگ و کەنێرە
شەوبۆ، وەنەوشە و شلێرە

هەڵز و مەندۆک و بیزایە
بیزا وەک بەژنی زیبایە

لەسەر شینکە و سەر پەلکی گوڵ
ئاورنگ کەوتوە زەنگوڵ زەنگوڵ

بۆنی تێکەڵاوی گوڵان
زیندوو دەکاتەوە دڵان

ڕەپستە کەروێشکەی دەکا
ماڵات تەواو چێشکەی دەکا

زیڕەی هەڵۆ و قاسپەی کەوێ
زەینێ ڕاوکەر نیوە شەوێ

بە بنە و کەو و دەزگاوە
بۆو بەستەزمانەی داو ناوە

جار جارەش لە چیا ولە ڕازان
ڕاو دەکا شمقاڕ و بازان

یا خودا تووڕەکەت بەر باد بێ
هەرچی گرتووتە ئازاد بێ

دیوتە زەویش چون دەجمێ
بە هۆی بارانە و نم نمێ

هەرچی تێیدا سەر دەر دێنێ
خۆی بە دونیایە دەنوێنێ

لە گرتووخانەی خاکی ڕەش
دێتە دەرێ پاراو و گەش

بەهار گشتی ئازادییە
ئازادی خودا دادییە

بە فەرمانی خودای گەورە
بایە و تێڕا خوڕی هەورە

بۆ هەر جێگا مەیلی بێنێ
بە کشت و کاڵدا دەڕشێنێ

ئەو دیمەنە چەندە جوانە
ئاخ گیان! لە سەر سوێی ژیانە

زەوی وەک بەهەشت خەملاوە
پیر چی بکا داتولاوە

پەسنی بەهار نایە دوایی
بۆ خۆ ماندوو کەم خۆڕایی

بەڵێ لە باسی بەهارێ
لادەین جارێ با ببارێ

چون وەک گۆمێکی بێ بنە
ئەوی چەند شیعری منە

کتێب و نووسراوان بێنە
هەزاران شیعری بێ وێنە

پێی هەڵگوتراوە و نووسراوە
من چیم گاوانێک لە دواوە

# بووکی یەکشەوە

هەستا چوە دیوە تایبەتی‌یەکەی خۆی، زوو جلە کوردی‌یە جوانەکەی داکەند و جلی ئیدارەی لەبەر کرد تا بچێتە بیمارستان. دایکی خەریکی هەڵوێزاردنی دیوی بەردستان بوو کە دیتی بە پێکەنینەوە گوتی:

- ئەیەڕۆ پەری بەو جلانەوە دەڵێی باڕۆکەی کلک کێشراوی.

پەری وەڵامی دایەوە:

- دایە بەو جلانەوە لە بیمارستان باشتر دەتوانم هەڵسووڕێم، دەنا لیباس ئازادە و دەتوانم بە جلی کوردیشەوە بچمە بیمارستان. دایە دەمەویست عەرزت بکەم ئەگەر ئێواریٚ درەنگ هاتمەوە نیگەران مەبە و دنیات لیٚ نەبێتە چەرمی چۆلەکە، خاتر جەم بە، نە ون دەبم نە کورگ دەمخوا لە ماڵە کاک شەهابی خۆمان بانگ کراوم نەهاری لەویٚ دەخۆم و پاش نیوەڕۆ دێمەوە. رەنگە باپیریش بێتەوە دوێنیٚ تەلەیفوونی لیٚ کردم وگوتی: کارەکەم تەواو بووە.

دایکی گوتی:

- رۆڵە گیان! بڕۆ بە خوا و پێغەمبەر و پیاو چاکانم ئەسپاردی. دەزانم نە کورگ دەتخوا و نە لەو شارە گچکەدا ون دەبی. بەڵام وڵاتەکەمان ئاڵۆز پلۆز و هەرچی و پەرچی‌یە بە خوای تا دەگەڕێیەوە هەموو رۆژیٚ دڵم لە مستیٚ دایە. ئەمما رۆڵە تۆ قەبرێکی بابت تێی چووە هێندە نێرگس عەزیەت مەدە، زۆرم خۆش دەویٚ، ژنێکی سەنگین و لە سەرەخۆ و بێدەنگ و بەستەزمانە. سەری ماوێژە سەر، فەقیرە، بەخۆیدا دەشکێتەوە و دڵی دێشی، گوناحت دەگاتیٚ.

- دایە گیان ئەتۆ ئەو گێلە دەبنەوە بڕەت نەناسیوە. بە قەستی لە مەجلیسان خۆی وا نیشان دەدا، دەنا وەک ماری سوججە بە گژ ئێمەدا دێتەوە و گەزارەی نیو گەز دەر دەکێشی و شۆرت و شۆمان دەر دێنیٚ و کارێکمان پێدەکا با بە دەواری شڕی ناکا. نازانی کاک شەهابی هەژاری چۆن کون دە جەرگ کردوە ؟.

- کچیٚ دە مەیرێسە ئەو ژنە فەقیرە مێشی لەبەر دەمی نافڕیٚ چۆن بەری نێو و نرکە و تەوس و لاتاوی دیل بیلان و چەختی وەک تۆ دەگریٚ؟.

- دایە گیان بۆ خۆت دەزانی لە منداڵی‌یەوە دەگەڵ نێرگس دەستە خوشکم قەتمان دڵ لە یەکتر نەیەشاوە. دەزانی قسەکانی من هەمووی گاڵتەی دۆستانەی نێو خۆمانە دەنا راستدەکەی نێرگس بە راستی ژنێکی چاک و دڵپاکە.

ئەوەی گوت و خودا حافیزی لە دایکی کرد و رۆیشت. تا گەیشتە دەرکی حەوشە دایکی لە پەنجەرەوە تێی دەفکری و دەیگوت:

" دەک دایکت بە قوربانی ئەم گفت و لفتە خۆشە، ئەم بەژن و باڵا بەرزە و ئەم رەوت و لەنجە جوانە بیٚ. یاڕەبی رۆڵە ئەوەندەی منت لیٚ رازی‌یە خوداش ئەوەندەت لیٚ رازی بیٚ، یا خوا روو سووری دنیا و قیامەت بی. بە بەختی چاک بی، دایک مەرگت نەبینیٚ. خودا یا شوکرانە بژێرم ئەگەر سوارەت وا زوو لیٚ ئەستاندمەوە، ئەم جووتە گوڵە، ئەم کچ و کوڕە باشەت داومیٚ.

کاک سواری مێردی دێد ئەستی و باوکی پەری و باپیر، پیاوێکی باش، خێرەومەند، قسە خۆش و تیٚگەیشتوو بوو. ئەگەرچی نەخوێندەوار بوو، بەڵام بە قەد حەوت مەلایانی دەزانی. چونکە بۆ خۆی زۆر زرینگ و وریا بوو و هەمیشەش وەختی بێکاری خۆی لە حوجرەی فەقێیان یا لە خزمەت مەلایان رابوارد بوو. تا لە دیٚ بوو زستانان هەر ئەو بانگی دەدا و قامەتی دەکرد. شەوانەش بیٚ شەو بوێر دەچوە حوجرەی فەقێیان و بەو دەنگە خۆش و زوڵاڵەوە لاوک و حەیران و بەیت و باوی کۆنی بۆ دەگوتن و شت لەوان فێردەبوو. بەیانان پێش مجێور دەچوە مزگەوت، چرای هەڵدەکرد کوورەی پێوە دەنا و بەرماڵی رادەخست و کە نوێژ دەبوو بانگی دەدا. کە جەماعەت سەفی دەبەست ئەویش قامەتی دەکرد.

کاک سوار دەوڵەمەندترین ئامپای ئاوەدانی بوو، بەڵام چڵکن دەوڵەمەند نەبوو، سەخی و بە دڵ و دەس بڵاو بوو، حەوتووی جارێک ماموستا و فەقێکانی بانگ هێشتن دەکرد. لە هەموو کارێکی خێردا پێشەنگ و پێشقەدەم بوو، کەیخودایەکی باش بوو، خەڵک رێزیان لیٚ دەگرت و قسەیان قەبووڵ دەکرد، کێشە و نێوان ناخۆشی ئاوماڵانی عادڵانە جیٚ بە جیٚ دەکرد. ئیرەئی بە کەس نەدەبرد.

کاک سوار هەمیشە خاوێنترین

و باشترین کەوا وپانتۆڵی دەبەر دەکرد. مام وسووی برای بەسەر کشت و کاڵ و مەڕ و پاتاڵ رادەگەیشت و کاکە سوار کاری زۆر سووکی وەک پاراو و شتی وا نەبا چی نەدەکرد.

کاکە سوار پیاوێکی کەڵەگەت، بەشان و باهۆ و سوار چاک بوو، هەمیشە ئەسپ و ماینی زۆر رەسەن و باشی رادەگرت و لە جلیت و رمبازی و شەرانخێویدا کەس نەیدە گەیاندێ. کە مەدرەسەیان لە گوندەکەیان دانا کوڕ و کچەکەی خۆی ناردە فێرگە. مودیری هان دەدا کە دەرس باش بڵێ و هێندەی ئیحترام دەگرت و چاکەی دەگەڵ دەکرد کە مودیر شەرمی دەکرد بەقسەی نەکا. منداڵەکانی زۆر زیرەک وهوشیار بوون و چاکیان دەخوێند. ساڵی ١٣٤٧ کە ئووەیسی کوشتارگای لە جەڵدیان دانا و مام وسووی بەستەزمانی بەتاوانی ئەوەی کە دەستەیەک چەکداری شەوێک لە تاوڵێ راگرتبوو گرت و پاش چەند رۆژ تیرەباران کرد. کاکە سواریش مەڕ و پاتاڵ و ئەسپ و ماینەکانی فرۆشت و دەستی لە جووت و ئاژەڵداری هەڵگرت و لە نێو شار خانوویەکی گەورە و خۆشی دروست کرد و دووکانێکی بەققاڵی دانا. لەوێش لە خێر و چاکە و هات و چۆی مەلا و فەقێیان کەمی نەکردەوە. هەر پێنج فەرزەی بە جەماعەت دەکرد. بەڵام دەستی لە گوتن هەڵگرت. دووکانەکەی بوو بە مەکۆی ئەدەبدۆستانی شار. ئەو کەسانەی ئاشقە ئەدەب بوون، ئێواران لە دوکانی کاکە سوار کۆ دەبوونەوە، ئەویش نوکتەی شیرین و قسەی خۆشی بۆ دەگێڕا- نەوە و بەیت و لاوک و گەلۆ وحەیرانی فێر دەکردن. ئەوانیش شیعری شاعیرەکانی کوردیان بۆ دەخوێندەوە، سەیر ئەوە بوو، ئەو پیاوە نەخوێندەوارە مانای زۆر بە رێ و جێی لە شیعرە جوانەکان دەداوە و رەخنەی زانایانەی لە شیعری هێندێک شاعیر دەگرت کە بە راستی جێی سەرسوڕمان بوو.

کاکە سوار تان و پۆی لە سەر وریش کەوتبوو. بەڵام هیچ شوێنەواری پیری پێوە دیار نەبوو. دووکانەکەی زۆر بە ڕمێن بوو چونکە هەموو کەس تێگەیبوو کە راست و دروست و بێ فڕو- فێڵ و هەرزان فرۆش و دەس خاوێنە. هەموو خەڵکی دێهاتی دەور و بەر و رووناکبیرانی شارەکەمان سەودایان هەر لەوێ دەکرد. کاکە سوار دەیگوت راستە ئیعدامی مام وسوو پشتی شکاندم ئەوەی ئەو لە کشت و کاڵ و مەڕداری دەیزانی من نەمدەزانی، بەڵام هۆی دەس لە جووت و گا و ئاژەڵداری هەڵگرتنم ئەوە بوو کە بتوانم بە منداڵەکانم بخوێنم تا پێ بگەن و تێ بگەن.

خوا هەڵناگرێ کچ و کوڕەکەشی جگە لەوەی ئیستیعدادی باشیان هەبوو چاکیشیان دەخوێند. تا ئینقیلابی پیرۆزی ئێران دەستی پێکرد هیچیان زۆر ناسراو نەبوون، بەڵام لە سەر و بەندی ئینقیلابدا خۆیان دەرخست. بەتایبەتی پەری کە هەزاران شیعری حەماسی کوردی لەبەر بوو. هەمیشە لە ریزی پێشەوەی خۆپیشاندانەکاندا بوو و بە خوێندنەوەی شیعری شاعیرە شۆڕشگێڕەکانمان خەڵکی هان دەدا. دەنگ خۆشی و زمان پاراوی لە باوکی بە میرات گرتبوو. تۆڵەی مامیشی لەو ریژیمە بۆگەنە لە بیر نەچووبۆوە.

پاش ئینقیلاب بۆ درێژەدان بە خوێندن چوە تاران و بوو بە نێرس و گەڕاوە بۆ شارەکەمان کە ژیان لێرەدا بێ مەترسیش نەبوو. بەڵام پەری خزمەتی خەڵکی بێ دەرەتان و هەژاری بەلاوە گرینگ بوو. لە بیمارستان کەس نەبوو دۆعای خێری بۆ نەکا و خۆشی نەوێ چونکە بە دەردومەرگی هەموو کەسەوە بوو.

باپیر ساڵێکی مابوو زانستگە تەواو بکا و ببێتە موهەندیس‌کە کاکە سوار لە بۆمبارانی شارەکەماندا لە بەر دەرکی مزگەوت شەهید کرا و خەڵکی شار بە تایبەتی کەس و کاری خۆی تازیەدار و ماتەمبار کرد.

* * *

بیست دەقیقەی بۆ وەختی ئیدارەی مابوو کە پەری گەیشتە بیمارستان حەوشەی بیمارستان لە نەخۆش وبریندا ـ ران زاوەی دەهات. تەماشای کرد جەندەکێک لەسەر دارە مەیت لە بەر دەرکی بیمارستان داندراوە، سڵاوێکی کرد و پرسی:

ـ ئەم جەندەکە چیە ؟.

پیاوێکی قەیرە لاوهاتە پێش و گوتی:

ـ بیلا مانی ئەو خێزانی منەو لە سەر تراکتۆر هەڵدێراوە و هەموو لەشی هاڕدراوە و بێحاڵە.

پەری بزەی لەسەر لێو نەما و بە کابرای گوت بیهێنە ژوور بزانم چی لێ قەوماوە ؟ بە چوار کەسان دارە مەیتەکەیان هەڵگرت و بردیانە دیوی چاوە نۆڕی دوکتۆر. لێفەو سیپاڵەکانیان لێ کردەوە و لە سەرنیو تەختێک رایان کێشا. پەری تەماشای کرد و تێگەیشت بە حاڵ ماوە و بە زەحمەت پشووی دێ. لە مێردەکەی پرسی:

ـ ئەوە بۆ وای بە سەر هاتوە ؟.

ـ خانم گیان دوێنێ ئێوارێ بە تراکتۆر دەچووینەوە، تەراکتورەکەم کەمێک چەپەی کرد و ئەوەش وای بەسەر هات بە نۆکەرت بم عیلاجیکی بکە. سێ منداڵی سەر و پێچکەم هەیە و کەسم نیە چاوە دێریان بکا.

پەری لێوی خۆی گەست، بەڵام چی نەگوت. لەو حاڵەدا دوکتۆر هات و ئەویش چاوێکی لە برینداره نیوه گیا ـ نەکە کرد و گوتی:

ـ زوو بیبەنە دیوی عەمەل.

پەری هاتەوە نێو خەڵک کاک شەهابی پزیشکیاری دەگەڵ بوو، گوتی:

ـ شوکر ئێوە چاکن و ئەوە کاک شەهاب تەماشاتان دەکا. ئەوەی زانی پێویستی بە موعاینەی دوکتۆرە رایدەگرێ و ئەوەی بۆی دەرمان کرا دەرمانی دەکا دەبێ ببوورن ئەو ژنە حاڵی باش نیە و رەنگبێ عەمەلی بوێ و وەختی دوکتۆر زۆر بگرێ.

پاش سەعاتێک پەری هاتەوە نێو خەڵک، بزەیەکی شیرنی لە سەر لێوان بوو مێردی ژنە بریندارەکەی بانگ کرد و گوتی:

ـ مزگێنیم دەیە ژنەکەت لە مردن رزگاری هات و رەنگبێ پاش دە رۆژی دی بگەڕێتەوە ماڵێ. بەڵام کاکە گیان! ئەو دەمی کە لە ژیانی ژنەکەت دڵنیا نەبووم دڵم نەهات سەر کۆنەت بکەم. ئێستا کە شوکر مەترسی و نیگەرانیم نەماوە پێت دەڵێم تەراکتۆر بۆ زەوی کێڵان دروست کراوە، نەک بۆ موسافیر کەشی. ئێوە تاکەی دەس لەو تەماعە هەڵناگرن و ژیانی خۆتان و خەڵکی دەخەنە مەترسی‌یەوە.

کابرا زۆری دۆعای خێر بۆ پەری کرد و بەڵێنی دا کە لەوەی پاش موسافیر سواری تەراکتۆر نەکا.

نیزێک سەعاتی سێ لە بیمارستان نەجاتمان هات وێکرا بەرەو ماڵی کاک شەهاب کە زۆر لە بیمارستان دوور نەبوو وەرێ کەوتین. خوشکە نێرگس چارشێوەکەی لە خۆی وەرگرتبوو و چاوەڕوانی ئێمە بوو. کە نیزیک بووینەوە خوشکە پەری بە دەست ئیشارەی بۆ کاک شەهاب کرد و ئەم شیعرەی بە دەنگێکی بەرز خوێندەوە:

**هێندمونتەزیری تۆبووهەتا چاوی سپی‌بوو**
**نێرگس کەلەسەریەک قەدەموودیدەچەقیبوو**

ئەم شیعرە ئەوەندە جوان و بە جێ بوو کە هەمووهانی سەرە ڕای ماندوویەتی و برسایەتی وە پێکەنین خست. نێرگس چەمۆڵەیەکی لە پەری نا و گوتی:

ـ جەرگت رەش بێ کچەتێوە دەم هەراشە هەر دەقسەی زەلامت کردوە. خۆڵت وە تر و تیتۆڵان بۆیە تەشک ودا وێنت وا جوانە... پەری پێکەنی و گوتی:

ـ بەسی برێسە، وەرە پارووێکمان نان بدەیە هەموو لە برسان لاترەی دەبستین، بۆ خۆت تا ئێستا حەوت جەمت کردوە. رەنگە ئەوەی خەز و بەز بێ بۆ خۆت لرفت دابێ. دەک نەوست دەبەرپێت کەوێ.

پاش ئەو شەڕە دندووکە کە ئێمە چووینە سەر ئەوان دەستیان دەستۆی یەک کرد وەک دە ساڵ بێ یەکتریان نەدیبێ کەوتنە رامووسینی یەک. من هەر دە فکر شیعرەکە دابووم ونەمدەزانی ئی کام شاعیرە ؟ گوتم:

ـ باجە پەری تۆ خوا ئەم شیعرە جوانە ئی کام شاعیرە؟.. پێکەنی و گوتی:

ـ ئەگەر پێتان دەڵێم زیاتر موتالا بکەن بۆ ئەوەیە. ئەگەر کەمێک شارەزای ئەدەبی کوردی بای دەتزانی ئەم شیعرە جوانە ئی(نالی) شاعیری مەزن و بە ناوبانگی کوردە.

تا نەهارمان کرد و پێکەوە بووین هەر لە سەر شیعری کوردی دواین هەموومان لە شارەزایی و شیعر ناسی و

زەوقی ئەدەبی ئەم کچە سەرمان سور ما ، زەردەی هەتاو بەحاڵ لەسەرترۆپکی کێوە بەرزەکان مابوو کە خودا حافیزیمان لە خوشکە نێرگس و کاک شەهاب کرد و لە حاڵێکدا هێشتا پەری گاڵتەی بە نێرگس دەکرد و ئەویش جوابەجەنگی دەکرد بە پێکەنین لێک جوێ بووینەوە و بەرەو ماڵ چووینەوە .

پەری کە گەیشتەوە بەر دەرکی خۆیان و شوێنی تەگەرە ماشێنی دی زانی کە ئەوە ماشینی خوازبێنی کەرانە کە موهەندیس پیرانی ناردوونیە سەر پەری، دوو مانگ لەوەی پێش موهەندیس کاغەزێکی بە ئەدەب و جوانی بۆ پەری نووسیبوو و داوای لێ کردبوو ئەگەر پێی خۆش بێ دەنێرێتە سەری. پەری کە یەک دوو جار زیاتر موهەندیسی نەدیبوو لە وەڵام دانەوەدا پەلەی نەکردبوو و کاغەزەکەی بە کاک شەهاب کە دەیزانی دوستێکی باش و بە ئەزموونیەتی نیشان دابوو. کاک شەهاب بێ ئەوەی ئەم رازە لە کن کەس بدرکێنێ تەحقیقی تەواوی لە سەر موهەندیس کردبوو و بۆی دەرکەوتبوو کە موهەندیسیش وەک پەری خەڵکی لادێیە و لە سایەی وریایی و زانایی خۆیەوە بۆتە موهەندیسی کشت و کاڵ و ماڵی باوکی هێشتا هەر لە گوندن و وەک خۆمان کرمانجن و لە هەموو بابەتەوە لایقی هاوسەری کچێکی وەک پەرییە و چەند رۆژ پێشتر وای کردبوو کە بە حوزووری ئەو لە جێگایەک یەکتر ببینن و قسەی خۆیان روو بە روو تەواو بکەن و هەر دووک یەکتریان پەسەند کردبوو و قەراریان دانابوو، لەو رۆژە دایک و پووری موهەندیس بچنە خوازبێنی و تامی زاری دێد ئەستی و موهەندیس باپیر بزانن . کاک شەهاب ئەو میوانییەی بەو مەبەستە کردبوو کە پەری ئەو رۆژە لە ماڵ نەبێ .

بە ئەسپایی دەرکەی کردەوە و چوە ژوورتەماشای کرد دایکی و خاڵە خدری و باپیر لە دیوی بەردەستان دانیشتوون خاڵە خدری پاش شەهید بوونی باوکی بەسەر دوکانەکەیان رادەگەیشت ـ کە وە ژوور کەوت هەر سێک لە قاقای پێکەنینیان دا و دایکی گوتی :

ـ بی بی جان خانم چۆن کەڵەکی واشت لە بن سەریێ دان؟ .

پەری شەرمێکی کچانە دایگرت وسوور هەڵگەرا و سەری داخست و یەکسەر چووە دیوەکەی خۆی و جلەکانی گۆڕین و بە خەیاڵ بوو ئەمشەو لە دیوەکەی خۆی وەدەر نەکەوێ . بەڵام زۆری پێ نەچوو دایکی هەرای کرد :

ـ پەری گیان ! ماڵی بابم ، لەوێ بە تەنێ چ دەکەی وەرە ئێرە .

پەری بە شەرمەوە چوە دیوی بەردەستان و بە ئەدەب دانیشت . دایکی گوتی :

ـ رۆڵە گیان دەتزانی ئەمرۆ خوازبینی کەر هاتبوونە سەرت ؟.

ـ بەڵێ دایە گیان ئاگام لێ بوو .

ـ وەڵڵا کچم دایکی ژنێکی وێچوو و کەیخودا ژنە ، بۆ خۆشی کە هەر لە ماشێندا دیم زۆر قۆزە. جا نازانم بۆ خۆت دەڵێی چی ؟ بەیانی دێنەوە تا جوابیان بدەینەوە .

باپیر هەڵیدایە و گوتی :

ـ خوشکێ گیان ! من پیرانی باش دەناسم کوڕێکی زۆر بە ئەدەب و پاک و چاکە ، مەدرەکی تەحسیلاتی بەرزیشی هەیە ، جا دڵی خۆت دەزانێ .

پەری لە بن لێوان گوتی :

ـ بۆ خۆتان دەزانن .

دایکی گوتی :

ـ ئەوە بۆ دەڵێی مانگی شەرمێتە. لە کەنگێوە وا شەرمێون بووی رەپ و راست بڵێ مێردی پێ دەکەم و رزگارمان بکە.

هەموو پێکەنین و ئیدی باسی ئەو مەوزووعەیان نەکردەوە. چەند رۆژ پاش باپیر من و کاک شەهاب و چەند کەسی دیکەی بانگ هێشتن کردبوو . لەپڕ مەلا و دوو فەقێ و پیرە پیاوێکی خاوێن و رەزا سووکی دێهاتی وەژوور کەوتن یەکێک لە فەقێکان دەفتەرێکی گەورەی لە بن هەنگڵدا بوو. لە بەریان هەستاین ، وە لای سەروومان خستن و لە سەر چۆکان دانیشتین . مامۆستا سیغارێکی داگیرساند و رووی لە موهەندیس باپیر کرد و گوتی :

ـ ئاغا میرزا ! مام سمایل بابی ئاغای پیرانێ یە و وەکالەتی شەرعی داوەتێ کە پەری خانم مارە بکا . ئێستا چ دەفەرمووی ؟.

باپیر گوتی :

ـ مامە گیان پڕ بە دڵ سوپاست دەکەم و ئێمە لە ئێوە هەر خزمایەتی خۆشمان دەوێ و ئیحتیرامی خوشکم و هیچی دیکە.

کورتی ببڕینەوە ئەوێ رۆژێ پەریمان لە موهەندیس پیرانی مارە کرد .

ل ٥١ ←

دەڵێن بیری منداڵی تیژە ، وەبیرمدێ منداڵ بووم و تازە زمانم کرابۆوە و چاوم جوانی و ناحەزی یەکانی دەدیت و گوێم هاڕە و هاشە و گرمە و جریوە و سریوە . لاق و لەتەرم ڕەشەبای زستان و گەرمە بای شەماڵی هاوینی لێک دەکردەوە .

دایک و بابم هەر دووکیان دێ نشین بوون و پێیان دەگوتم لە نێو نۆقەنۆق و بۆڕە بۆڕی گامیش و مانگایاندا لە دایک بووم ، ئەو دەمی ژیان ساکار بوو ، شیرێژە و رون ، ماستی رۆژی و دۆی ترش ڕازێنەرەوەی سفرەی ماڵان بوون ، پڵاو و گوشت و مریشکی سوورکراوە یا شۆربا و مریشک مەگەر بە دەگمەن ساڵێ چەند جاران لێنرابان ماڵێ وا بوو بە دوو مانگان جارێک ئاوی گەرمیان بە خۆوە نەدەدیت بەڵام ،

بەڵام هەموو رۆژێ چەند جار دەنگی بالۆرەی کیژانی وەک ئاسکی سڵی چاو رەش لە سەر کانیاو و بەر بێر گوێی دەلا واندەوە و تووڕەی شمشاڵی شوان تێکەڵی بارە بارِ و بێڵە بێڵ و حیلە حیلی مەڕ و بزن و ئەسپان دەبوو .

وەبیرم دێ وادەی کاکێشان بوو هەر جووتیارەی خەلە و خەرمانێکی هەبوو جووتە کەڵی لە نزیک جێخون و خەرمانان بەرەڵڵا دەکرد و بە بای شەماڵ خەرمانی هەڵداوێشت و گەنمی سووری لە کای سپی جوێ دەکردەوە ، هەر لەو وەزعەدا بوو کە جارجارە بێ دەنگی سروشت بە شریخەی خەرەزەن یا بە لەقە لەقی کەڵەوە و جیڕەی تەگەری عارەبە یا بە دەنگی خۆشی بەیت بێژێک تێک دەچوو ، راستە کە شەو و رۆژی ئاسمانی دێ مەیدانی باڵەفڕە و هاتـ و چوونی مەلانی خۆش ئاوازە بەڵام زۆر جاران لە نیوە شەوان ، یا لە تاریک و روونی بەیانی یا لای خەوتنان دەنگێکی خۆشترم گوێ لێ دەبوو ، دەنگی دی نشینێک یا پاڵەیەک کە لەمەزرایە دەگەڕاوە و لە بەر خۆیەوە دەستی دەکرد بە گوتنی هەوایەک ، یا بەیت و مەقامێک . یەک بە تاقی تەنێ خۆ لە پۆتەی دەبڕی و بە یادی یاری چەلەنگی بە سەر و گوێلاک شکاوی مەم و زینی دەگوت ، ئەوی دی لاس و خەزاڵ ، بەیتی ئیمامی عەلی ، دم دم ، حەیران یا بەهارە و پاییزە ! دڵەو مەکۆی غەم و شادی ، هەر چی بێ دەبێ هەڵڕژێ....

ئەوڕۆ کە دونیای بە نێو پێشکەوتوو و نوقم کراو لە ئاسنەواڵە و باروت دەرفەتی هەناسە هەڵکێشانی بۆ کەس نەهێشتۆتەوە ، راستە دێ هەر ئەو دێیە کە لە پێشدا بوو بەڵام سەر جێخون و پەرێز و ئەو جۆرە جێیانە بوونەتە پێخوستی تەگەری تراکتۆر و کومباین، ماکینەی بژارە وار و تۆوچێن و هاڕە هاڕ و خڕەخڕی وانەش تەواوی بەیت و بالۆرەکانی لە گەرووی دێ نشینی دڵتەڕدا خنکاندووە و هەر عەلی کەردارێک یا حەمەی بەیتانێک پەیدا دەبن ژیان و ماڵ و حاڵی خۆیان بە پاراستن و گوتنەوەی وان ببەستنەوە .

منیش وام بە پێویست زانی هەر نەبێ دوو مقامی بەهارە و پاییزەیان لێ بنووسمەوە هەتا سەرەڕای ئەوەی کە دەنگیان لە نێو گرمە و هەرای شارستانیەتی دڵڕەقدا ون بووە نێویان بمێنێ و لە مێژووی ئەدەبی گەلەکەماندا تۆمار بکرێ .

بە کورتە باسێک لە سەر بەهارەی

---

* کاک مەحموودی شکاک نیژاد یەکێک لەو زانا دڵسۆزە کوردانەیە کە زوو بە هاوارمانەوە هات و نووسراوەی بە کەڵکی بۆ ناردووین . ئەوەی لەم ژمارەدا چاپکراوە و ئەو بۆی ناردووین بەهارێکە کە بە بڕوای ئێمە زۆر کۆنە و زۆریش جوانە بەڵام شارەزای فۆلکلۆری ئەدەبی ئێمە لای وایە ، یەک : ئەم بەهارە شاعیرەکەی نەناسراوە و ئی ئەحمەدی کۆر نیە . چونکە دەگەڵ سەبکی ئەو شاعیرە ناسراوە یەک ناگرنەوە . دوو : چاوەڕوانی ئەوەین لەوەش زیاترمان لە بارەی ئەو بەهارەوە پێ بگا . شتە جوانەکانی دیکەی کاک مەحموود بۆ ژمارەکانی داهاتوو هەڵدەگرین و هیوادارین درێژە بە هاوکاری خۆی بدا .

حەمەی بەیتان "محەممەدی غەززالی" وەکی لە دوایین بەشی مەقامەکەوە دەر دەکەوێ ، حەمەی بەیتان ئەو شیعرانەی لە فەرهەنگی فۆلکلۆری دەر نەکێشاوە و لە شیعرەکانی خودالێخۆش بوو ئەحمەدی کۆرن ، بەڵام هەرچی گەڕاین نەمانتوانی سەرچاوەیەکی رەسەن لە ئەحمەدی کۆر ببینینەوە و شیعرەکانی پێ راست بکەینەوە .

راستە شاعیر لەو شیعرانەدا خۆی زۆر لە رێ و شوێنەکانی عەرووزی نەداوە و پتر پاڵی وە ئاهەنگ و رێک کردنی دوا وشە داوەتەوە و هەوڵی داوە ئاخری میسرەعەکان یەکتر بگرنەوە کاک حەمەی بەیتان وادیارە لە چەند جێگایان بۆ ئەوەی ئاهەنگی شیعرەکانی لە دەست دەرنەچێ لە خۆیەوە چەند وشەیەکی تێ هاویشتووە وەک"ئەزهەڵگرت" یا خۆی هاوێشتۆتەوە نێو شێوازی بەیت و باو لەبەر ئەوەی خۆی لە بەیت بێژە بە نێو بانگەکانی ناوچەی موکریانە زۆر بەیتی کوردی کوتووە و لە سەر شریت تۆماری کردوون . بەڵام هەر چونێک بێ کاک حەمە لەو مەقامەدا توانیویەتی بە جوانی دیمەنی نیشتمانی کوردان نیشان بدا و هەست و ویستی سەرەکی و ساکاری کورد لە ئاهەنگ و قسەدا بنەخشێنێ .

کێیە چووبێتە دوڵی هەوشینان، هومام و بایز بەگان ، شەڵماش و کاژێ، یا سەری قەندیلی مامە کۆیان و ......و بەهاری رەنگین لەو ناوچانەدا سەرسووڕماوی نەکردبێ و بۆنی هەزاران هەزار گوڵ و گیای بۆن خۆشمەستی کری کردگاری نەکردبێ ، راستە هەز کاک حەمەی بەیتان بەهارەمان بۆ دەڵێ ، بەڵام دەنگی ئەو بەیت بێژە خۆشی لە خۆ نەدیوە بەسەر هاتی تاڵی و شیرنی گەلێکمان وەبیر دێنێتەوە کە بە دەیان و سەدان و هەزاران ساڵە پالیان وە رەوەزە بەردی ئەو ناوچانە داوەتەوە و دەمێک هەناسەی بێ بەشی هەڵدەکێشن و سەردەمێکیش چاویان بە پشکووتنی هەزاران گوڵ خونچە روون دەبێتەوە .

ئەوەش دەقی بەهارە کە لە دەنگی حەمەی بەیتان هەڵگیراوەتەوە .

مەکەن مەنعی عاشقان عیشق کاری دیژوارە
هەچ کەس عیشقی دەر دڵ بێ بێ سەبر و بێ قەرارە
دەعیشقیدا سووتاوم غەمم لە چوار کەنارە
گەلۆ دەردان ئەز هەڵگرت ساتێک ناگرم قەرارە
دڵم چەندە لە جۆشە و ئەسرینم دینە خوارێ
شەو و رۆژ ناسەبرێنم لەبەر غەمی دەیارێ
مەگین بەوەی ساکین بم بە رەنگی دە بەهارێ
مزگێنی بێ لە دۆستان لە برادەران دەڵێن ئەوڕۆ بەهارە
بەهارمان چەندە خۆشە دەڵێن ئەوڕو هنات بەهار
دەیەن تەیری دەڕەنگین جووت بەجووت بوون بەقەتار
زەینێ لە دم شەت ئاوان لەوانم دی چەند هەزار
دە عیشقی دا سووتاوم ئەی گەلی یار یار
ئەو بەهاری وا رەنگین لێم بوو بە بازاڕ وشار
مزگێنی بێ لە دۆستان لە برادەران دەڵێن ئەوڕۆ بەهارە
غەمم لە دڵی چەند زۆرن با بڕۆن دەگەڵ زستانێ
هەوری دەڕەش دەهاتن دەگرن بەری عاسمانێ
لە گوڕڕەی دە شەماڵی لە رێژنەی دە بارانێ
کوێستان ئاوا بوو دەتەمدا ئەوەڵ مانگی نیسانێ
مزگێنی بێ لە دۆستان لە برادەران دەڵێن ئەوڕۆ بەهارە

لەو کوێستانی دە عەزیم چەندم لێ کرد خەیاڵە
بولبول لە چوار کەناران ، بۆنیان دەهات هەڵاڵە
کەسک و سوور بوون وەنەوشە سومبول بەتافتەی ئاڵە
لە بەر بۆنی وەنەوشان دەکەوتن بە بێ حاڵە
مزگێنی بێ لە دۆستان لە برادەران دەڵێن ئەوڕۆ بەهارە
لە بەر بۆنی وەنەوشان لەو هەناسەی شی بایە
بۆنی گوڵان دەهێنێ تێکەڵ بوو لە سەحرایە
مەدحی بەهارێ یاران هەرگیز لە تاریف نایە
مزگێنی بێ لە دۆستان لە برادەران دەڵێن ئەوڕۆ بەهارە
لەو کوێستانی دەوا رەند دڵی منە حەزینە
گوڵبون لە دەم رووباران جوان دەبوون بەپەرژینە
با بێنی گوڵان ببیەن هەچ کەس دڵی غەمگینە
ئەو گوڵی دە دنیادا وەفایان بۆ کەس نینە
مزگێنی بێ لە دۆستان لە برادەران دەڵێن ئەوڕۆ بەهارە
لە سوێسنەی دە ساوا تازە لە من سەر دەدا
کەسک وسوور بوون وەنەوشە سوورگوڵ بەتافتەی زەردە
مێلاق و خاش خاشک ئەتڵەسی سوور لە بەردا
ئەو دونیایەی وا رەنگین وەرە دەستی لێ بەردە
مزگێنی بێ لە دۆستان لە برادەران دەڵێن ئەوڕۆ بەهارە

لێرەدا دووەمین نموونە لە شیعری فۆلکلۆری بەهار کە بە دەستمان گەیشتوە بڵاو دەکەینەوە تا ئەگەر خوێنەر ئاگاداری یەکی زیاتری لەسەر ئەم شیعرە هەیە بۆمان بنووسێ یا رەخنەبگری ٠

ئەگەر لە راستی لانەدەین سروشت و تەبیعەت لە بەهاردا ئەوەندە جوانە کە هەر حی بەدڵ تێی فکرێ دەتوانێ بەشێوە-یەک هەستی دەروونی دەر برێ . لە زۆر جێگا من ئەم بەهارەم بە نێوی ئەحمەدی کۆر ەوە بیستوە، لە دوایی شیعرەکەشدا خۆی بە ئەحمەد دەناسێنێ ، بەڵام پێم وایە ئەو ئەحمەدە ، ئەحمەدی کۆر نیە . جونکوو :

١ ـ ئەم شیعرە لەگەڵ شێوازی شیعری ئەحمەدی کۆر جیاوازی هەیە و ئەم شاعیرە زۆرتر هەنگاوی لە رێبازی شیعرەکانی فەقێ تەیران ناوە و ئەسپی خامەی لەو رێگایەدا لینگ داوە . جا بۆ وەی قسەکەم هەروا شتێکی سەیر و سەمەرە نەبێ ، وێنەیەک لە شیعری ئەحمەدی کۆر دێنمەوە ، تا هەم ئێوەی تینووی ئەدەب لەگەڵ شێوازی شیعری ئەحمەدی کۆر شارەزا بن هەم ئەو دوو شیعرە پێکەوە هەڵسەنگێنن وبزانن تا کوێ بوێ چووم :

دوێ شەوێ دیتم لەخەودا یار منی بەدڵ دەوێ
دەست لەسەر دەست دەم لەنێو دەم شاد لەعیشی وێ شەوێ
وێ شەوێ بەزم و نیشات بوو ،کەیف وئاهەنگ وبیسات بوو
بەهرەیی فەیز و نەجات بوو ،لاڵ و کەر کەوتم لەوێ
لاڵ و کەر وەک زەن عیووبەن ، کەشفی ابصار القلوبا
بمدەنێ دوو روویی خووبان حاشا لیالله نامەوێ
نامەوێ من عەیش و عوشرەت ،تەرک دەکەم ئەسبابی لەززەت
زۆر دەکێشم رەنج و زەحمەت لە دوا زاتی پەرتەوی
ئەحمەدی کۆر بەس خەیاڵ کە ، حوببی دونیایە بەتاڵ کە
یەکی بگرە یەک تەلاق دە پێکۆ نابن دوو هەوێ

٢ ـ ئەگەر سەیرێکی وردی شیعرەکانی روودەکی بکەین

هەوری رەشی تاریک کرد دامێنی کۆهساران
لەو بەهاری سەوز پۆش لە شکۆفەی دەداران
وەنەوشەم چەند زەریف دین گوڵان لە دەم رووباران
بە کەسک و سوور دەخەملێن لە سەر جۆ و جۆباران
دەڵێن ئەورۆ هات بەهار مزگێنی بێ لە یاران
مزگێنی بێ لە دۆستان لە برادەران دەڵێن ئەورۆ بەهارە
هەر هەوری رەش دەهاتن هەور دێن و دەخرۆشن
بە عیشق بیرە بەهارێ گوڵان زێر باف دەپۆشن
هەر وەکوو سەحرای چینێ جومڵەی میسک فرۆشن
لەبەر شادی بەهارێ چەند لە کەیف ولە جۆشن
مزگێنی بێ لە دۆستان لە برادەران دەڵێن ئەورۆ بەهارە

بەهار هاتنە سەر تەختان گوڵان دێن لە نەکاوە
تەرمی گوڵان چەند زۆرن دەگەڵ سوێسنەی دەساوا
مزدە بێ لە بلبلان عاشقێکی دڵ سووتاوە
ئەو دونیایەی وا رەنگین وەفای بۆ کەس نەماوە
مزگێنی بێ لە دۆستان لە برادەران دەڵێن ئەورۆ بەهارە
گەلۆ دەردان ئەز هەڵگرت لەسەر ئاو و دم ئاوان
دەیەن تەیری دە رەنگین دەکەوتن لە شەتاوان
لەبەر سەدای شالووران ئاورم بەر بووە هەتاوان
مزگێنی بێ لە دۆستان لە برادەران دەڵێن ئەورۆ بەهارە
مەدحی بەهاری زۆرە هەرگیز دەتاریف نایە
چەندسوارچاک ومەردچاک بوون کۆچیان کردلەودونیایە
" ئەحمەد ئەتۆش هەر دەمری لە بۆی بکەین دوعایە

بۆمان دەر دەکەوێ کە هەر چی پەیوەندی بە دیتنەوە هەیە و بەچاو دەبینرێ لێی پرینگاوەتەوە و تەنیا باسی بۆنی خۆش و دەنگی خۆش و شتی وای کردوە، وەک دەڵێ :

بوی جوی مولیان آید همی
یاد یار مهربان آید همی

ئەگەر رووداوێکی لە نیعمەتی بینایی بێ بەش نەبا دەیتوانی باسی دیتنی دیمەنە جۆر بە جۆرەکانیش بکا . ئەحمەدی کۆریش کە شاعیرێکی درۆزن نەبوە و نەیتوانیوە لەگەڵ هەستی دەروونی خۆی درۆ بکا ، بەو پێ و شوێنە خۆی لە باسی ئەو جوانی یانەی بەچاو دەبینرێن بواردوە . لە هەموو جێگایە- کیش ئیقراری بە کوێر بوونی خۆی کردوە . لە حالێکدا لەم شیعرەدا قسە لە دیمەنە جوانەکانی بەهار دەکرێ کە رێی تێ ناچی هی شاعیرێکی نابینا بێ .

٣ - ناوەرۆکی شیعری ئەحمەدی کۆر بریتی‌یە لە ستایشی‌خودا و باسی دین و هەڵسەنگاندنی دین و دنیا ، و ئەم باسانە لەگەڵ ئەم شیعرەدا کەوەک شیعرێکی فۆلکلۆریک دەچێ و بە جوانی تەبیعەت و دیمەنی بەهاردا هەڵگوتراوە جیاوازی‌یەکی زۆری هەیە .

مەکەن مەنعی عاشقان عیشق کاری دژوارە
هەر چی عەشقی لە دڵ بێ بێ‌سەبر و بێ قەرارە
دایم لەبەر هیجرانی رەنگ زەرد و لێو بە بارە
دە عیشقێدا سووتاوم غەمم لە چوار کەنارە
دەرد و خەم و حەسرەت و گریانم دێن هەزارە
گەلۆ دەردان چ لێ بکەم ساتێ ناگرم قەرارێ
شەو و رۆژی ناسەبرێم لە بەر غەمی دە یارێ
دڵی من چەند لە جۆشە ئەسرینم دێنە خوارێ
مەگەر بەوەی ساکین بێ بە رەنگی دە بەهارێ
بە گوڵانم سێبووری دێ سەر بێننە دەر لەخارێ
بەهارم چەندە خۆشە یا خودا بەخێر بێی بەهار
هاتن تەیری دەرەنگین جووت بەجووت بوونە قەتار
کەوتن لەدەم شەتاوان لەوانم دین چەند هەزار
ئەو بەهاری دەرەنگین لێم بوون بە بازاڕ و شار
گوڵ هاتنە پێ کەنینێ لەهەر نەوعێ بوون هەزار
هەوری رەش تاریکی کرد گرتی بەری ئاسمانێ
غەم لە دڵی من چەند زۆرن با بڕۆن لەگەڵ زستانێ
هەی لە گوڕەی شەماڵێ ، وەی لە رێژنەی بارانێ
کوێستان دەمان لە تەمی هەوەڵ مانگی نیسانێ
بە گوڕەی دە شەو بایە گوڵ خۆی داوە لە سانێ
هەوری دەڕەش دەخرۆشن لە دامێنی کۆساران
لەو بەهاری سەوز پۆش لەبەر شکۆفەی داران
بە زەرد و سوور دەخەملێن گوڵان لەدەم رووباران
وەنەوشەم زەعیف دەدین شین دەبوون لە جۆباران
وەک دڵی من خەمناک بوو وردە خوناوی باران
لە کوێستانی دە عەزیم هەوری دەڕەش دەخرۆشن
بە نەخشی دە بەهارێ گوڵان زەربافتە پۆشن
هەر وەکوو سەحرای چینێ جوملە میسک فرۆشن
لە شادی دە بەهارێ چەن لە زەوق و لە جۆشن
گوڵ هاتنە پێکەنینێ ئەی بۆ بولبول خەمۆشن

زەینی خۆم دا کوێستانی چەندم لێ کرد خەیاڵە
گوڵ بوون لە چوار کەنارێ لێم شین دەبوون هەڵاڵە
زەرد و سوور و بەنەفشە سوورگوڵ وئافتەی ئاڵە
لەبەر بۆنی وان گوڵان یاران دەبوون بێحاڵە
ئەدی بولبول لە کوێ یە بکێشی ئاه و ناڵە؟
سیوادی دە سوێسنان تازە لە من سەر دەدا
خاشخاشک و گوڵی مێلاق ئەتڵەسی سوور لەبەردا
وەنەوشەم چون غەمگینە هەر چەشنی ئافتەی‌زەردە
ئەو دنیایەی وا رەنگین مەرد بە دەستی لێ بەردە
یارێکی بێ وەفایە لە بۆ کەس فایدەی نادا
لەبەر گوڕەی شەماڵێ لە هەناسەی شەو بایە
بۆنی گوڵان دەهێنێ تێکەڵ بوون لە سەحرایە
لە خارێ وەدەر کەوتن دەریان دەکرد گەلایە
ئەو گوڵی زەرد و زەعیف بوونە بەرگی دنیایە
یاران مەدحی بەهارێ هەرگیز لە تاریف نایە
بەهار هاتە سەر تەختێ گوڵ پشکووت لە نەکاوە
تەرزی گوڵانم زەردن ئەو سوێسنی دە ساوە
موژدە بدەن بە بولبول عاشقێکی دڵ سووتاوە
ئەو دنیایەی وا رەنگین وەفای بۆ کەس نەماوە
چەن نەوجەوانی هەڵداشت بۆ خۆی ئێستا هەرماوە
بۆنی گوڵان ئەز هەڵگرت لەدەم شەت و سەراوان
هاتن تەیری دە ڕەنگین کەوتن لە دەم شەتاوان
لەبەر سەدای شالووری گڕ بەر بوو لە هەناوان
فرمێسکم دێ بە جووتە خوێناوم دێ لە چاوان
لە حەسرەتی دە یاری نالەم دێ وەک سووتاوان
نەوبەهاری بە گوڵزار هەرگیز دە تاریف نایە
لە بەر خەمی دەیارێ شەو و رۆژم خەو نایە
چەن جوانی لاو چاکم دی کۆچیان کرد لە دنیایە
ئەحمەد ئەتۆش رادەبری یاران بۆت کەن دوعایە
موژدە بێ لە برادەران جێن ( جنت الماوی ) بە

## ... پاشماوەی کورتە باسێک لەسەر ...

ح لە جێگای بزوێنی " و " ی فارسی و عەرەبی هەر " و " دەنووسن بۆ وێنە لە جیگای " کُرد " دەنووسن " کورد " و لە جێگای " دور " پێس دەنووسن " دور " کە ئەوکارەش جێگای رەخنەیە چونکوو تەلەفوزی " پیس = ضمه " و بزوێنی " وو " لە کوردیدا وەک یەک نین و نابێ وەک یەکیش بنووسرێن .

جگە لەو وشانەی لەسەرەوە هاتوون لە هێندێک وشەی دیکەدا دانانی " و " لە جیاتی " وو " هەڵەیەکی گەورەتر پێک دێنی و دەبێ بە هۆی ئەوە کە دوو وشە کە نە مانایان وەک یەکە و نە تەلەفوزیان ، وەک یەک بنووسرێن وەک : " کور " و " کوور " کە بەو رێنووسە هەردووکیان دەبن بە " کور " " تور " و " توور " کە بەو رێنووسە هەر دووکیان دەبن بە " تور " . " قولە " و " قوولە " کە بەو رێنووسە هەر دووکیان دەبن بە " قولە " ، یا ....

ئەوانەی نووسینی " وو " یان پێ باش نیە لەوە دەترسێن کە لە هێندێک جێگادا " و " ی عەتف بەدوای " وو "دا بێ و زیاد بوونی " و " ەکان دزێو بێ وەک : " وسوو ووسێن " کە چوار " و " بەدوای یەکدا هاتوون . بەڵام ئەوە هاسانە و دەبێ " و " ی عەتفی نێوان دوو وشە دوورتر لە وشەکان بنووسرێ و لێکیان جیا بکاتەوە ، وەک: " وسوو و وسێن "

تێبینی ١٠: بزوێنی " ی " هەم لە جێگای " زیر " ی فارسی و " کسره " ی عەرەبی دەنووسرێ و هەم لە جێگای بزوێنی " ی " ی فارسی و عەرەبی ، وەک : " انسان = ئینسان" " انقلاب = ئینقیلاب " ، " ایمان = ئیمان " ، " شیراز = شیراز " ، " ساری = ساری " . بزوێنی " ێ " تایبەت بە زمانی کوردی یەو لە زمانی فارسی و عەرەبیدا نیە .

تێبینی ١١: هێندێک کەسیش لە نووسیندا لە نێوان "زیر = کسره " و بزوێنی " ی " دا جیاوازی دادەنێن ، و لە جێگای " زیر = کسره " بزوێنی " ی " و لە جێگای بزوێنی " ی " بزوینی " یی " یا " ێ " دەنووسن . وەک :"انسان = ئینسان" " انقلاب = ئینقیلاب " ، " ایمان = ئییمان "، " شیراز = شیراز " ، " ساری = ساریی " ، " یا " ایمان = ئێمان" " شیراز = شێراز " ، " ساری = سارێ " کە پێمان وایە کارێکی دروست نەبێ چونکوو :

یەکەم : لە نێوان " ێ " و " یی " یا " یێ " و "یی" دا هەر بەو دەلیلەی کە لە تێبینی ٥ دا بۆ " وو " و " وو " گوتمان نووسینی " یی ویێ " لە نووسینی " ێ و یێ " جوانتر و ئاسانترە .

دووەم : لەئەسڵدا جوێ کردنەوەی شێوە نووسینی بزوێنی " زیر = کسره " و بزوێنی " ی " پێویست نیە . چونکوو لە زمانی کوردیدا تەلەفوزی ئەو دوو بزوێنە زۆر لێک نزیکن و دەتوانین بڵێین هەر یەکن . بە شێوەی ئاسایی لەکوردیدا بە جێگای " اسلام " دەڵێن " ایسلام " بە جیگەی " انسان " دەڵێن " اینسان " و بە جیگای " شِرکَت " دەڵێن " شیرکَت" کەوابێ هەر وەک ئەو دوو بزوێنە لەگوتنداوەک یەکن لە نووسینیشدا وەک یەکیان دەنووسین .

«درێژەی هەیە»

## .... پاشماوەی چ بنووسین

یان " بە پیرۆز ( مبارک ) زانینی رۆژی هەینی"و....

٨. پەندی پێشینیان = پەندی پێشینیان کە زۆربەیان " سێ سێ " ن واتا لە هەر پەندەیدا سێ شت هاتوە لە فۆلکلۆری کوردیدا زۆر گرینگن وەک :

" لە هەورا زان مەڵێ کوتنێ ، لە بەر بایە مەکێشە تووتنێ ، مەچۆوە سەر ماڵی بابی ژنێ " .

یان :

نە کوێرە کانی دەبێ بە باغ ، نە کەلاوە دەبن بەوەتاغ نە کچەتیوان ( کچە هەتیوان ) دەبن بە شەوچراغ .

٩. قسەی خۆشی پێشینیان = وەک قسەکانی " خودا لێ خۆشبوو سەید رەشید " یان قسەکانی " خودالێ خۆشبوو مامەند ئاغای شەختانی " و قسەکانی " خودا لێ خۆشبوو مەلا ئەحمەدی تەوحیدی " و ....

١٠. کایە = کایەکان دوو جورن :

ـ کایەی مندالان وەک " پشیلەی ماڵە مێرانی " و " خوزێن " و " هەمزەل " و ....

ـ کایەی گەوران وەک " جۆرا بێن " و " میر میرێن "و..

ل ٤١

توێژینەوەی : سەید محمد صمدی

# کەڵبەش چ بوون

لە مێژ بوو کەلیمەی کەڵبەش لە مێشکمدا کایەی دەکرد و ئەمنی بەخۆیەوە مەشغووڵ کردبوو . دەمکوت خودایە دەبێ مەنزوور لەو وشەیە چ بێ؟ راهیبرەن وای دەگەیاند کە چەشنێک بیر و باوەڕە ، ئەویش بیر و باوەڕێکی کە لە نێو خەڵکی مەقبوول نیە . زۆر دیترا وە کە ماموستایەکی ئایینی بەعزە بڕوایەکی بووە کە زۆربەی خەڵک پێیان خۆش نەبووە ، نێویان بۆ ئەو ماموستایە بڵاو کردۆتەوە کە فلانە مەلا کەڵبەشە . لە بەعزە نووسراوەیەکدا دیبووم کە کەڵبەش نێوی تایفەیەک لە کوردانە ، بەڵام ئەو تەوزیحە لە گەڵ ماناکی کە لە وڵاتی ئێمە لێی وەدەر دەکەوت فەرقێکی زۆری هەبوو ، هەر بەو هۆیەش بوو کە هەر لە دڵمدا بوو کە وەختێکی بۆ تەرخان کەم و بە وردی لێی بکۆڵمەوە و ئەوەی دەستم دەکەوێ لە ریسالەیەکدا بڵاوی کەمەوە . حاسڵی ماوەیەک زەحمەتم لە بوولتەنێکی فارسی حەوت پەڕیدا لە مانگی جۆزەردانی ساڵی ١٣٦١دا بڵاو کردەوە . لە دوای بڵاو بوونەوەی زۆرتری دوستان بیر و باوەڕی خۆیان لەو بابەتەوە بۆ دەنووسیم دەیاندامێ . لێرەدا کە کوردی ئەو ریسالەیەو پێشکەش دەکەم ، تەواوی نەزەرە نارەکانیشی رەدکەڵ خراوە و لێی زیاد کراوە .

کاتێک دەستم بە تەحقیق کرد ، تەواوی ئەو کەسانەی کە لەو بابەتەوە شتێکیان دەزانی دەیانکوت کە تەنیا کەسێک کە لەو بارەوە بکرێ کەڵکێکی باشی لێ وەر بگیرێ پیاوێکە بە نێوی " مەلا صادق زەندی " خەڵکی گوندی " بایزئاوێ " ئەترافی خانێ(پیرانشهر ) ئەو پیاوە نێو بەدەرەوەترین کەڵبەش بوو . دەکوترا کە تەحسیلات وخوێندنێکی باش و زۆری نەبوە ، بەڵام ئیتتلاعاتی عموومی یەکی زۆر و سەری هەبوو .بەرەو بایزئاوێ رێ کەوتم شەوێ لە نەغەدە لە ماڵی مەلا عومەری ئەمیر ئابادی ( ساحیبی کتێب فرۆشی خەییا ملەنەغەدە ) مامەوە . لە دوای بڕێک قسە کردن ،هەر لە گەڵ هۆی سەفەرم پێ کوتن . جەنابی مەلا عومەر و چەند میوانێکی کە لەوێ بوون کوتیان کە نیزیک شەش مانگ لەوە پێش ستوونێکی دەوڵەتی بۆ پاکسازی بایزئاوێ چوو ، لەو جەرەیانەدا کوللەی ناغافڵ وە مەلا صادق کەوت و لە تەمەدی حەفتا ساڵەگیدا کۆچی دوایی کرد . ئەو هەواڵە زۆری ناڕەحەت کردم بەڵام چارەچ دەکرا ؟ یەک دوو رۆژ لە نەغەدە مامەوە و لە گەڵ چەند کەسێک لەو بارەدا ( مەسەلەی کەڵبەشان ) دوام وشنها یەکم وەکوّ کرد و گەڕامەوە .

لە شاری سابڵاغێ (مەهاباد ) سەرجاوەیەکی زۆر چاک و گرینگم وە دەست کەوت ، ئەویش دۆستی زۆر بەڕێز و خۆشەیستم ئاغای ( سولەیمانی ئەمیر عەشایری ) کە بە کاک سێمان نێوبانگی هەیە ، بوو. ئەو مرۆڤە بەڕێزە خەڵکی " شاوەلە " یە کە دەکرێ بڵێین شاوەلە کانگای کەڵبەشان بووە. کاک سێمان پیاوێکی ئەهلی فەزل و ئەهلی تەحقیق . لەو بارەوە ئیتتلاعاتێکی زۆر باشی لە ئیختیار نام کە لێرەدا بە ئەرکی سەر شانمی دەزانم دیسان سپاسی بکەم .

هەر لێرەوە دەچینە سەر ئەسڵی مەتڵەب .

نیزیک سەد و سی (١٣٠) ساڵ لەوەپێش پیاوێک بە نێوی مەلا صادق زەندی کە گۆیا لە تایفەی زەند و لەبنەماڵەی کەریم خانی زەند بووە . ( و بۆ ئیسباتی ئەو قسەیە شەجەرە نامەیبووە ) هاتۆتە گوندی شاوەلە و ماڵی لەوی داناوە و خەڵک پێیان کوتوە " خەلیفە مەلا صادق " . بە قەراری مەعلووم ئیشی

خەلیفەگەری لە لایەن شێخی " کانیکەوە "ی کردستانی عێراق دراوە بەو پیاوە بەلام لە بەختی بەدی خەلیفە مەلا صادق ئەو زەمانی تەواوی خەلکی ناوچەی لاجان ( مامەش ) موریدی شێخ کەمال کە لە سەیدەکانی گوندی خالدار و خەلیفەی سەید نەهای شەمزینان بووە ، بوون . کەوا بوو خەلیفەگەری مەلا صادق رەنگ و بۆنێکی وای نەبوە . لە شاوەلە بە هاوکاری " محمد ئاغای مامەش " چەند ئاسی ئاوی دروست کردوە و لە رێگەی ئاشەوانییەوە رۆژگاری تێپەڕ کردوە یەکێک لە ئاشەکان ئەلئانیش شوێنەواری ماوە . ئەو پیاوە برایەکی بووە بە نێوی " مام شەفیع "کە هەر دووک لە شاوەلە ئەمری خودایان بەجێ هێناوە و لە قەبرستانی وێ ناژراون .

مەلا صادق دوو کوڕی بووە :۱. مەلا برایم ۲. مەلا رەسوول . مەلا برایم لە هەوەلەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی لە شاوەلەی کۆچی دوایی کردوە و لەتەنیشت

**مەلا رەسوولێ کوڕی مەلا سادقی زەند بە بناخە دانەری کەلبەشان نێو بانگی هەیە ... مەلا رەسوول لە پەسوێ لەگەل دوو کەسان بە نێوی " هەمزە ئاشەوان " و " وەستا قادر مەحموود " ئاشنا دەبێ و بیر و باوەڕی تایبەتی خۆی فیری وان دەکا ... لە گوندی " سەرگیز "یش نەجارێک دەکەنە هاوبیری خۆیان بەنێوی " وەستا ئەحمەد کەلبەش " و چونکی هەر ئەو وێراویەتی بیر،و باوەڕی خۆی تەواو دەربڕێ ئەو چەشنە عەقیدەیەش بە نێوی کەلبەش نێوبانگی دەر کردوە .**

باوکی نێژراوە .

مەلا رەسوول لە مەدرەسەی علوم دینی شاوەلەی دەست بە خوێندنی زمانیعەرەبی دەکا و ماوەیەک لە مەحزەری ماموستای پایە بەرز حاجی مەلا موحەممەدی شەرەفکەندی ( باوکی ماموستا هەژار ) نەبوو ، هەر بۆیە لە دوای ماوەیەک خوێندن شوغلی موعەللیمی هەلبژارد و خودا لێ خۆشبوو " مارف ئاغای ئەمیر عەشایری " ( باوکی کاک سێمان ) بە عینوانی ماموستا ( معلم ) لە لای خۆی رایگرت و مەلا رەسوول دەرسی بە پیرۆت

ئیستیفادە دەکا . ئەگەر چی عیلمی عەرەبی تەواو ناکا ، بەلام تارادەیەک لەو فەننە بەلەد دەبێ . مەلا رەسوول تەبعی شیعرێکی زۆر جوان و ناسکی دەبێ و نازناوی ( تخلص )، " ئەدیب " هەلدەبژێرێ . شیعرەکانی بلاون و هەر ئێستا بڕێکی لە لای ماموستا مەلاموحەممەدی زەندی ( بایز ئاوێ ) هەیە و ئەغلەب خەلکی ئەو ناوچەیە شیعری وییان لەبەرە . هەر بۆیە ئەگەر ئێستا کەسێک هیممەتێ بکا و بچێتە ئەو مەلبەندە دیبانیش درەنگ نیە و دەتوانێ بەشێکی زۆر لە ئاساری ئەو پیاوە کۆ بکاتەوە ئەلبەت لە لایەن ماموستای خودا لێخۆشبوو گیوی موکریانی شتێکی چەند پەڕی لەسەر مەلا رەسوول بلاو بۆتەوە کە زۆر کەم و ناتەواو و پڕ هەلەیە . لە مەلا رەسوولێ ئەدیب شیعری زۆر جوانی کوردی فارسی ، عەرەبی و تورکی بە جێ ماون، بە داخەوە بڕێکیشی هەجو هەیە .

مەلا رەسوول پێش نوێژی زۆر پێ خۆش،

ئاغا ، سەلیم ئاغا ، قادر ئاغا کوڕانی مارف ئاغا دەکوت . یەکێک لە شاگردەکانی دیکەی مەلا رەسوول ،جەنابی ئاغای " میرزا برایم فازیلی " یە کە هەر ئێستا مالی لە نەغەدەیە وپیاوێکی زۆر خۆش قسە و باسەواد و شاعیرە ، لەدوای ماوەیەک مەلا رەسوول لە شاوەلە-ڕا دەچێتە پەسوێ و لەوێش دەبێتە ماموستای عەلی ئاغا کوڕی مەرحوومی قەرەنی ئاغای مامەش و کاک عەبباس کوڕی مام عەزیزی ئەمیر عەشایری. لەوێش زۆر نامێنێتەوە ئەوجار دێتە گوندی " سەرگیز " لە ئەترافی شنۆیە ، لەویش هەر ماموستایی دەکا و حاجی کاک رەحمانیئەحمەدی لەلای خۆی رایدەگرێ و بە دوو برای حاجی کاک رەحمان دەرس دەلێ و فارسی یان فێر دەکا . لەوگوندە دەبێ کە مەلا رەسوول دوچاری نەخۆشی سیل (یان ئازارەباریکە ) دەبێ و کۆچی دوایی دەکا . لەو گوندەلە گۆڕستانی ( ئوغلو بابا ) کەلەداوێنەی کێوێک لە رۆژهەلاتی گوندی کۆنە قەلا و رۆژئاوای نەزرە میز هەلکەوتووە ، ناژراوە . مەلا صادق زەندی کە پێشتر باسیم کرد و کوتم کە لە جەرەیانی پاکسازی بایزئاوێدا کوژرا وداخەکەم نەیگەیشتمێ کە لە بابەت کەلبەشانەوە قسەی لەگەل بکەم، کوڕی مەلا رەسوولێ ئەدیب بوو .

تا ئێرە بە وردی باسمان لەسەر مەلا رەسوول کرد . بۆ ؟ چون ئەو بە بناخە دانەری کەلبەشان نێوبانگی هەیە .

مەلا رەسوول لە روانگەی ئەدەبیاتی کوردی یەوە پیاوێکی گەورە بووە و شوێنەواری جوانی لەپاش بەجێ ماوە

بەڵام لە روانگەی بیروباوەڕو عەقیدەوە عەقیدەیەکی زۆر ڕووناک و مەعلوومی نەبوە . هەمیشە لە دنیادا ئینسانی وا هەن کە لە هەر مەسلەک و عەقیدەیەک گوڵچینێکی دەکەن و بڕێکی قەبووڵ دەکەن و بەعزە جێگەیەکیشی قەبووڵ ناکەن . مەسەلەن بەخۆیان دەڵێن موسڵمان بەڵام ڕۆژوو گرتنیان لەبەر گرانەو نایگرن. نوێژیان لەبەر گرانە و نایکەن . لە ئیسلامەتی چەند شتێکی هاسان و هەرزان و بێمایە هەڵدەبژێرن . لە مەسیحی‌یەت چەند قسەی جوان هەڵدەبژێرن و .... بەو چەشنە نە ریگە و ئایینێکی دیاریکراو- یان هەیە و نە تەواو بێدینن . ئەوە پێویستە لە چەندین روانگەیان ڕا ئینسانی وا بەرڕەسی بکرێ و تەواوی هەل و مەرجی ئەو زەمانی بێتە بەر چاو تا روون بێتەوە کە چ شەرایتێک بۆتە هۆی ئەوە کە بەعزێک ئاوایان لێ بێ . ئەوە بەدبەختی یە کە ئینسان و بە دوای ویدا کۆمەڵ وای لێ بێ کە هیچ رێگەیەکی رووناک و موشەخەسی نەبێ و لە هەر شتێک بڕێک بزانێ و لە عالەمێکی نیوە تاریک و نیوە رووناکدا بژی. لە ڕۆژگارێکەوە فیرقەی ئیسماعیلیە لە ئێرانێدا پەیدا بوو ، و ئەسەرو شوێنە- واری خراپ و ژەهراوی خۆی تێکەڵ تەواوی بەشەکانی ژیانی ئینسان کرد. بە داخەوە لێرەدا ناتوانین زۆر لە ئەو مەبەستە بڕۆین ، چون لە ئەسڵی مەتڵەب دوور دەکەوینەوە . بەڵێ‌بینەوە سەر قسەی خۆمان: مەلا رەسووڵ لە پەسوێ لە گەڵ دوو کەسان بە نێوی " هەمزە ئاشەوان " و " وەستا قادر مەحموود" ئاشنا دەبێ و بیر و باوەڕی تایبەتی خۆی فێری وان دەکا . یەکێک لە مەشهوورترین عەقیدەکانی دژایەتی‌یەکی زۆر توند بووە لە گەڵ ئاغایان بوو- یەتی ، بەڵام چون ئەو زەمان قەرەنی ئاغای مامەش قودرەت و دەسەڵاتێکی زۆری دەبێ ، ناوێرن ئەو قسانە لە نێو خەڵکی بڵاو کەنەوە . لە گوندی"سەرگز" پێیان کوتوە " وەستا ئەحمەد کەڵبەس" و چونکی هەر ئەو وێراویەتی بیر و ڕای خۆی تەواو دەربڕێ ئەو چەشنە عەقیدە- یەش بە نێوی وی نێوبانگی دەرکردوە . دوای کۆچی دوایی مەلا رەسووڵ و ئاڵ و گۆڕێک کە لە ئەوزاعی دنیادا دێتە

هەمیشە لە دنیادا ئینسانی وا هەن کە لە هەر مەسلەک و عەقیدەیەک گوڵچینێکی دەکەن و بڕێکی قەبووڵ دەکەن و بەعزە جێگەیەکیشی قەبووڵناکەن . مەسەلەن بەخۆیان دەڵێن موسڵمان بەڵام ڕۆژوو گرتنیان لەبەر گرانە و نایگرن . نوێژیان لەبەر گرانە و نایکەن . لە ئیسلامەتی چەندشتێکی هاسان و هەرزان و بێمایە هەڵدەبژێرن . لە مەسیحی‌یەت چەند قسەی جوان هەڵدەبژێرن و... بەو چەشنە نە رێگەو ئایینێکی دیاریکراویان هەیە و نە تەواو بێدینن . ئەوە بەدبەختی یەکە ئینسان و بە دوای ویدا کۆمەڵ وای لێ بێ کە هیچ ریگەیەکی رووناک و موشەخەسی نەبێ و لە هەر شتێک بڕێک بزانێ و لە عالەمێکی نیوە تاریک و نیوە رووناکدا بژی .

پێش نەجارێک دەکەنە هاوبیری خۆیان بە نێوی وەستا ئەحمەد . ئەو وەستا ئەحمەدە بیر و بڕوای خۆی زۆر ئاشکرا بڵاو دەکاتەوە هەموو چەشنە خەتەرێک دەکڕێ . ئەو وەستا ئەحمەدە کەڵی نیو چاوان سپی‌یەکە لە کوردیدا پێی دەکوترێ کەڵی بەش ، هەبووە . بۆ خۆمان ئەوەی باش دەزانین کە لە گوندەکانی کورد نشین ئەو عادەتە هەیە کە مەسەلەن ئەگەر کەسێک حەیوانێک یان ماڵاتێکی عەلامەتداری هەبێ ، خودی ئەو کەسەش نێو و عەلامەتی ماڵاتەکەی بە نێوەوە دەنووسێ . کاک عەلی‌یەک گایەکی قوڵەی هەیە ، پێی دەڵێن عەلی گا قوڵە . هەر لە ناوچەی سندووس ( سلدوز ) عەلی گا قوڵەیەک هەبوو کە گۆرانی‌یە قەدیمی یە کوردی یەکانی زۆر جوان دەزانی و ئەغڵەبی مەقامەکانی زۆر باش دەکوت وەستا ئەحمەدی نەجاریش بەو هۆیە پێش و قودرەتی ئاغاوەتان لە کەمی‌دەدا و ڕەزاخان بە سەر وڵاتدا زاڵ دەبێ . وەستا ئەحمەد لە شنۆیەڕا دەچێتە ناوچەی لاجانی و لە گوندی " کیلە سفلا " ماڵی دا دەنێ و لەو گوندەی عالەمێکی زۆر دەکاتە هاوبیری خۆی .

لە مەشهوورترین عەقیدەکانی وانە ئەو چەند شتە بوون :

١) . بەربەرەکانێ یەکی توند لەگەڵ ئاغایان و هان دانی رەعیەت بە دژیوان.

٢) . خوداوەند لە قورئانیدا دەستو- وری بە نوێژ کردن داوە . بەڵام نەیفەرموە پێنج کەڕەت لە شەو و ڕۆژیدا جا ئینسان چ شەو و ڕۆژ نوێژی بکا چ لە تەواوی ژیانیدا جارێک نوێژ بکا هیچ فەرقێکی نیە و هەر وەک یەکە .

٣) . بە " جەبر " موعتەقیدن و پێیان وایە کە هەموو شتێک لە پێش بە دنیا هاتنی ئێمەدا تەعیین کراوە و ئێمە هەر

چی بکەین خۆ ماندوو کردنە . ئەڵبەت روونە کە ئەو باوەڕە تا چ رادەیەک خراپ و هەڵەیە و ئەگەر ئینسان ئەو عەقیدەی هەبێ ناتوانی مەزهەری هیچ خزمەتێک بێ .

٤) . زۆرتری بیر و باوەڕە هەڵەکانی فیرقەی " ئیسماعیلیە " لە قسەکانیاندا دیارە .

ئەڵبەت لێرەدا لازمی نازانم کە لە ئەفراد نێو بەرم ، بەڵام زۆربەی کەڵبەشەکان بوونە دوو دەستە ، دەستەیەک کوتوویانە : ئێمە پەیڕەوی مەسنەوی مەولەوین و هەر چی ئەو بیڵێ ئەوە دەکەین . دەستەکەی دیکەش ئەغڵەب بوونە ماتریالیست و مادە پەرستی تەواو .

بیر و بڕوای وانە تێکەڵاوێک بووە لە : جەبریگەری ( اعتقاد بە فلسفەء جبری ) برێک لە ئیسلامەتی ، .برێک لە ماددەگەرایی ، و کەڵبەش ( کەڵی نێو چاوان سپی ) هیچ پەیوەندی یەکی لەگەڵ (( گاو آپیس )) نیە ، چون بەعزێک ئەو شکەشیان هەبووە .

ئەو کەسانەی کە تا ئەو رۆ نێویان بە کەڵبەشی زۆر مەشهوور دەر چووە و: ئەغلەب شاگردی وەستا ئەحمەد بوون :

١ ـ میرزا مراد نێوێک کە خەڵکی تۆبزئاوایە بوو و ئێستا نەماوە .

٢ ـ مام کاکاللە ،یەکێک لە مالیکانی تۆبزئاوایە و خوشکەزای مەلا رسووڵ

٣ ـ کاک برایم نێوێک خەڵکی خورینج کە پێیان دەکوت " برایمە گۆشتە .

٤ ـ نەجارێکی خەڵکی گەنەدار ، بە نێوی " وەستا حەمە رەسووڵ "

٥ ـ میرزا مراد نێوێک خەڵکی شنۆیە لە پێشدا لە گوندی " باڵاگیر " دەبوو دوایە هاتە " سینگان "ێ .

٦ ـ دەرویش یووسف نێوێک کە پێیان دەکوت : مام وسوو . لە پێشدا لە گوندی " دێ گورجە " دەژیا دوایە هاتە سینگانێ ، بیسەواد بوو ، بەڵام زۆر جوان شیعری دەکوت .

٧ ـ وەستا ئەحمەدی ئاسینگەر کوڕی حاجی مستەفای پیرمەند کە هەر ئێستا زیندوە و لە شاری نەغەدە خەریکی ئاسینگەری یە .

لێرەدا کە باسمان دوایی دێ پێویستە بە چەند نوکتەیەک ئیشارە بکەم بێ شک هەر بیر و باوەڕێک لەشەرایەتێکی تایبەتی ، زەمانی ، مەکانی ، کۆمەڵایەتی ، ئابووری ، فەرهەنگی و ....دا بەدی دێ و ئەگەر بمانەوێ بە هەڵە نەچین ، پێویستە کە تەواوی ئەو مەبەستانە وەبەر چاو بگرین ، ئەوڕۆ شەرایەتێک لە مەملەکەتەکەمان بە دی هاتوە کە تەواوی ئەو کەسانە کە بیر و باوەڕی وایان لە رابردوودا بوە ، لە فکری خۆیاندا تەجدیدی نەزەریان کردۆتەوە ، ئەوانە هیچ شتێک نین کە ئێستا بە گوناح لە سەریان بنووسرێ هەر بۆیە تکا دەکەم ئەو کەسانەی کە لەو بارەدا شتی دیکە دەزانن بێڵێن و بینووسن ،چون یەقین بزانن بۆ ساز کردنی داهاتوویەکی پڕ شادی و کامەرانی لازمە رابردوو جوان بناسین و لە هەموو کونج و گۆشەکانی ئاگادار ببین .

هەر بژین بە سەربەرزی و سلامەتی .

---

... پاشماوەی چ بنووسین

١١. گاڵتە و گەپ = بۆ خۆش رابردن و پێکەنین گاڵتە و گەپی جۆر بە جۆرمان هەیە وەک :

ـ چیرۆک : چەشنی چیرۆکەکانی مەلای مەزبوورە

ـ کایە : = راوە ژووشک

ـ شیعر : = شەڕە فڕ

ـ گۆرانی : = بەند هاوێشتن

١٢. شێعر = زۆربەی شێعرە فۆلکلۆریکەکان بە گۆرانی دەگوترێ وەک :

تایەک لە زوڵفت ها وە دەسمەوە

بەندی دڵی پسێ پێی ئەبەسمەوە

یان :

هەتا ئەمن بووم بە گوێی بانەوە

بەرتیلیان دەدا و دەپاڕانەوە

ئێستا کە پیر بووم پێم دەڵێن خاڵۆ

بەرتیلیش دەدەم نامکەنە ماڵۆ

١٣. گۆرانی و مووسیقا = ئەوانەی کە لە مووسیقادا شارەزان دەتوانن لە قام و گۆرانی و هەواجۆربەجۆرەکاندا بکۆڵنەوە و شتیان لە سەر بنووسن و بیانپارێزن . لەو بارەدا دەبێ چەند شت لە بەرچاو بگیرێ :

ـ شێعری گۆرانی و قام .

ـ هەوا و ئاهەنگی ئەوان .

ـ نەوعی گۆرانی وەک قام ، حەیران ، بەند ، قەتار ، لاوک ، بالۆرە ، و ....

ـ ئەگەر بکرێ چۆنیەتی سازبوونی ئەوان .

هیوا دارم ئەو رێنوینی یە ببێتە هۆی قەڵەم بە دەستەوە گرتنی لاوە بەزەوقەکانمان بۆ نووسین و پەرە پێدان بە ئەدەبی کوردی .

# بەهار

مامۆستا حەقیقی

بەهارە و سەردەمی سەیران و گەشتە
دەر و دەشت و چیا وێنەی بەهەشتە
لە بزۆێنی زەمەندی کێو و دەشتە
تەبەق جاران حەوت بوو ئێستە هەشتە

زەوی هەر وا لە شکدا هەشتە یا نۆ
پەڵەی هەوران کران دیسان حەواڵە
لە کێوان گرمە گرم و ناڵە ناڵە
لەحاندی بۆنی بەیبوون و هەڵاڵە
عەبیر و میشکی چین مەشکەی هەڵاڵە

لەمەولا عەتری قەمسەر کەم دەکەن بۆ
لە نێو باغی گوڵان شەونم دەبارێ
سەفا دێ خەو دەتۆرێ ، خەم دەتارێ
لە رازان قاز و قومری دێنە خوارێ
قەلی روو رەش بلێ با خۆی وەشارێ

لە بەر چەنگ و پەلی بازان و شاهۆ
ئەگەر بەرزە و نەوی دیوە و نەدیوە
ئیرەم دیو دیمەنی ئاوای نەدیوە
رەقیبی کاخ و قەسران کۆخ و دیوە
نموونەی جەننەتی کەیوان خەدیوە

هومای ئەندێشە ماون دەستەو ئەژنۆ
لە دەشت و چیمەن و یاڵ و قەد و شان
سەفئارایی دەکەن پۆلی وەنەوشان
شلێر و سوێسن هەم سوڵتان و هەمشان
رەفیقان خەو بەسە وەختی تەماشان

بەیان بەر بوو گزنگی دا لە ئاسۆ
لە سەر سینەی چیا لیزگەی گوڵی یاس
بە وێنەی خشڵ و گەردەنبەندی ئەڵماس
گوڵ و بولبول لەگەڵ یەک لێدەدەن لاس
دەخوێنن "انیکاد" و سوورەیی"ناس"

هەتا دوور بن لە چاوی پیس وشانۆ
شەوی مەهتابە شەونم شوعلە رادێر
دورِی وردن پریشکی ئاوی هەڵدێر
رەفیق و هەمدەمم لەو دەشتی زەنوێر
حیکایەت خوانی مەولانایە بلوێر

کەوی کێوی دەفە و چەنگە و پیانۆ
گزنگ ئەنگووت و گوڵ پشکووت و باری
لەسەر فەرشی زومورِود رەنگی باری
بەهار ئەی بووکی بێ وێنەی لەباری
قەتاری بارە شایی زێرِە باری

کەمە بۆ زێرِ وەشان سەر باشە کۆکۆ
بە غونچەی پێ کەنی گوڵ بۆیە سڵ بێ
نەڵێ وێنەی دڵم پەرژینی گوڵ بێ
لە دووری تۆ ئەگەر ژینم بە دڵ بێ
ئەگەر دڵ غەیری تۆ بۆ کەس لەکوڵ بێ

لە پێی مەحشەر وەبالی تۆمبە ئەستۆ
پەیامی دا جەوانێکی هەوسباز
بە پیرێکی کە هێنابووی لە ژین واز
کە تۆش بووتە وەکوو من یاری دڵخواز
ئەتۆش دیوتە لە یاران عیشوە و ناز

چ ماون خاتیرەی ئەو دەم لەلای تۆ؟
وەڵامی داوە ئێستا هەر مناڵی
ئەتۆ عیشقی مەجازیت دیوە کاڵی
لە شێخی مەسنەوی جوویا بە حاڵی
"کە دڵ بێ عیشق -سندووقێکە خاڵی"

دڵێکی وا کە تۆنەت دیوە ئەوتۆ
بە یاری رۆژی رووت و پەرچەمی شەو
بە رۆژی روون دڵت بردم بە شەو خەو
قسەن پەیمانی ئەتلانتیک و وەرشەو
ئەوان با هەر لە فێڵێ بن لەمولەو

ئەمن پەیمانی تۆ نادەم بە ناتۆ

# چیرۆک بۆ منداڵان

# حاجی ڕێوی

له توحفەی موزەففەرییە وەرگیراوە

دەگێڕنەوە ڕیوێیەک شەوێکی چوو بۆ مریشک خواردنێ . چوە سەربانی خمخانێکی ، لە ڕۆچنی ڕا دەخمی کەوت هەموو گیانی شین بۆوە ، چوە کن کەڵەبابی. کەڵەباب گوتی :" مام ڕێوی بۆ کوێ دەچی؟". گوتی:" مەڵێ مامڕێوی بڵێ حاجی ، تۆبەم کردوە ، دەچمە حاجێ ، ئەتۆش دەگەڵ خۆم دەبەم". کەڵەباب گوتی :" خێر ، دەبێ بێی ، خەرجت بۆ خۆم دەکێشم". کەڵەباب لە ترسان نەیوێرا بڵێ نایەم ، ڕەگەڵی کەوت . لەدڵێ خۆیدا ددانی لە کەڵەباب تیژ کردبوو ، بە زاهیری دوعای دەخوێند زیکری دەکرد ، تا کەڵەباب بزانێ، ڕێوی تۆبەی کردوە . کەڵەباب لەترسان هەر پێدزیلکەی بوو ، ڕۆین هەتتا گەیشتنە مێشێکی ، تەماشایان کرد پەپووسڵەمانکەیەک لەسەر داریە . ماندوو نەبوونی لە ڕێوی کرد ،گوتی:

" مام ڕێوی ، ئۆغربی ". کەڵەباب گوتی :" مەڵێ مام ڕێوی بڵێ حاجی، ڕێوی تۆبەی کردوە ، دەچێتە حەجی، ئەمنیش دەگەڵ خۆی دەبا ، ئەتۆش وەرە بچین ". پەپووسڵەمانکە گوتی : " ڕاوەستن ، دەچم خولاحافیزیی لەماڵێ دەکەم، زوو دەگەڕێمەوە". لە سەری ڕاوەستان هەتتا دێتەوە. ڕێوی لە دڵی خۆیدا خۆشی خۆشی بوو ، دەیگوت :" دوو نێچیرم وەدەست کەوتوە ". پەپووسڵەمانکە زوو گەڕاوە ، ملی ڕێیان گرت و ڕۆ ین ، هەتتا گەیشتنە سەر چۆمێکی ، تەماشایان کرد مراوی یەک لە ئاوێدا هات و چووی دەکرد. ماندوو نەبوونی لێ کردن ، گوتی :" بەخیر ! بۆ کوێ دەچن ؟ " ڕێوی گوتی :" تۆبەم کردوە ، دەچمە حەجی ". کەڵەباب گوتی : " مراوی ، ئەتۆش وەرە نیزیک مردنتە تۆبەیەکی بە حەق بکە ، بەڵکی خولا بتبەخشێ ". گوتی:" زەریفە ئەمنیش دێم". لە ئاوێ وەدەر کەوت ڕەگەڵیان کەوت . ڕۆین هەتتا گەیشتنە دارێکی، قشقەڵەیەک لەسەر دارێکی بوو ، ماندوو نەبوونی لێ کردن، گوتی بۆ کوێ دەچن ؟". گوتیان :" دە خزمەت ڕێویدا دەچینە حەجێ ". گوتی:" ماڵوو شێوێ ئەنگۆ شێت بوون، ڕێوی هەمووتان دەخوا ". گوتیان:" نا ، مام ڕێوی تۆبەی کردوە ، هەموو ڕۆژی بەڕۆژووە ، لە ئاوی شەوێ پارێزی دەکا ، دەچێتە حەجێ ". زۆریان دەبەر قەلی هەڵخوێند، ئاخری هاتە خوارێ ، ڕەگەڵیان کەوت. ڕێوی لەرێیە هەر لەبەر خولای دەپاڕاوە. شەوێ گەیشتنە کێوێکی ، شەوێ لەوێ مەنزڵیان گرت . ڕێوی کونێکی دیەوە هەمووی دەوێ کردن. بۆخۆی لەزارکی کونەکەی دانیشت نیوەشەوێ زۆری برسی بوو ، چونکی ئەوی ڕۆژێ هیچی نەخواردبوو ، زۆریش ماندوو ببوو گوتی :" وێستا وادەی خواردنیانە ". قشقەڵە لە ژووریدا پێی گوتن :" ماڵ وێرانینە ، دیتان چلۆنوو خۆ دەگیر خست ؟ وێستا ڕێوی هەمووومان بانگ دەکا . یەک یەکی دەمانخوا . هەرکەس مەردە خۆی نەجات بدا ". ڕێوی هەوەڵێ کەڵەبابی بانگ کرد ، گوتی :" وەرە ، دوو سێ قسان بکە ، نەزیرێکم بۆ بگێڕەوە ".کەڵەباب لە ترسان هاتە زارکی کونەکەی . ڕێوی گوتی :" کەڵەباب ، ئەتوو بۆ چی خەوت لە خەڵکی حەرام کردوە ، نیوە ـ شەوێ دەست دەکەی بە قیژەقیژێ؟ مەگەر ئەتوو چی وادەکەی ؟ مەگەر خولا ئەتۆی بۆیە دروس کردوە؟ کەڵەباب گوتی:حاجی ڕێوی ، ئەمن قازانجم هەیە بۆ خەڵکی

سروە ٤٣ ← ل ٤٧

# جەمیل سیدقی زەهاوی[3]
# وباوکی
# مەلا محمّدی فیض[4]

ئاماده‌کردنی : سید عبدالصمد

به بای زەهاوه بەهاران کە هەوری رەش ئەگری — بە شینی بلبلە گریانی شەونم و هەوری
هەزاری گولشەنی ئەم خاکە پاکە بوو تاک بوو — فەزای ئەدەب وچرای شیعرەکانی رووناک بوو
بە باڵی شیعر و ئەدەب شاهبازێکی‌میعراج بوو — شەهی سەریرە ئەدەب فەلسەفەیشی سەرتاج بوو
ئیتر نەماوە ئومێدم لە داری دنیا دا — بگاتە ریزی سیدقی کەس لە شاری" زورا "(۱)دا
بە میسرەعێکە ، دەمی مەرگ وتەرجمەی حالمان — (کسووف روژە "ذهاب"ی زەهاوی لای عالمان(۲))

پیرەمێرد

هونەرمەند ، زانا ، نووسەر هەر کامیان پەنجەرەهایەکن لە شوورەی پۆلاّ و بەردینی قەلاّی نەتەوەکەیان گیراون و بەرەو نەتەوە و ولاّتانی عالەمدا دەکرێنەوە. میللەتێک کە لەم پەنجەرانە بێ نەسیب بێ لە تەنیایی و تاریکی هەمیشەییدا دەژی . بەڵێ.لە تاریکی و بێ دەنگی‌یەکی سەرسام هێنەر- دا رادەبوێرێ کە بە هیچ کوتە پەڕۆیەکی رەنگاو رەنگی بەدارا کراو چارەی ناکرێ و لەم بەڵایە رزگاری نایێ بە هۆی ئەم پەنجەرانەوە هەم رووناکی وەر دەگیرێ و هەم رووناکی دەبەخشرێ.

جەمیل سیدقی زەهاوی لە گەورەترین بوێژەکانی عێراق کە لە رۆژی یەکشەمۆ سێهەمی رەشەمەی سالی ۱۳۱۴ ی هەتاوی رێکەوتی بیست و نۆی ذی القعدەی ۱۳۵۴ ی مانگی لە بەغدا کۆچی دوایی کرد و سال و نیوێک بەر لە وەفاتی، یانی رۆژی پێنجشەمۆ دوازدەی رەزبەری سالی ۱۳۱۳ بە نوێنەرایەتی لە لایەن دەوڵەتی عێراق بە هاورێ یەتی شاعیرێکی گەورەی ئەو ولاّتە بە ناوی " احمد حامد الصراف " هاتنە ئێران و لە جەژنی هەزارەی لە دایک بوونی فیردەوسیدا بەشداری کرد، خۆی لە ئەسلّدا ئێرانی‌یەوباوکی " مەلا محمد فیض " خەڵکی سەر پێڵ زەهاو بووە.

ئەم باوک و کوڕە هەر چەنّد بە هۆی مانەوەی زۆر لە عێراقی عەرەبە زمانی عەرەبی بۆ ئەوان وەکی زمانی زگماکی

لێهاتبوو و هەر دوانیان بە تایبەت جەمیل سیدقی بەم زمانە هۆنراوەی بەرزیان هۆنیوەتەوە و لە ریزی شاعیرانی عەرەب زمانی عێراق دەژمێر-درێن، بەڵام پێویستە بزانین کە نە " فیض " و نە جەمیلی کوڕی هیچ کامیان زمانی فارسییان فەرامۆش

جەمیل لەم کونگرەیەدا سەبارەت بە پلەی بەرزی شیعری و فەلسەفی و سەبارەت بە درێژی تەمەنی کە پتر لە حەفتا ساڵ دەبوو بە ناوی " مقدم الشعرا " و سەرۆکی کۆڕی ڕۆژهەڵاتناسان و زانایانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا هەڵبژێردرا .

نینۆ پاگلیارۆ " مامۆستای مێژووی هەڵسەنگاندنی زمانەکانی کلاسیک و مامۆستای زمانی ئێرانی لە زانکۆی سەلتەنەتی ڕۆم ( ئیتالیا ). " عبدا - الحمید عبادی " مامۆستای مێژووی ئیسلام لە زانکۆی ئەدەبیاتی میسر. " عبدالوهاب عزام " مامۆستای فارسی

کۆنگرەی هەزارەی فیردەوسی . لە خوارەوەڕا ریزی سێهەم نەفەری هەشتەم ، مامۆستا جەمیل سیدقی زەهاوییە .

نەکردووە و بەم زمانەش شیعریان داناوە . هەر وەکوو جەمیل سیدقی لە کاتی بەشداری لە کونگرەی هەزارەی فیردەوسیدا دەستە شیعرێکی لەسەر هەوای شانامەی فیردەوسی دانابوو کە خوێندییەوە و دوو بەیتی هەوەڵی شیعرەکە ئەمەیە :

**بە فردوسی از من سلامی برید**
**پس از عرض حرمت پیامی برید**
**کە ای شاعر خفته در زیر خاک**
**نهان از نظر دور از جان پاک**

لەم کونگرەیەدا کە لە کۆشکی " دارالفنون " ی تاران پێک هاتبوو سی و هشت کەس لە زانایانی جیهانی بەشدارییان کردبوو کە ئێمە لێرەدا بۆ ناساندنی پلەی زانست و ریزی مامۆستا جەمیل سیدقی تەنیا چەند کەسیکیان ناو دەبەین :

" ئاتسووجی ئاشیکاگا " مامۆستای ئەدەبیاتی زانکۆی توکیۆ. " سباستیان بک " مامۆستای زمانەکانی ڕۆژهەڵات لە زانکۆی بڕلەن ( ئالمان). " ئانتۆ-

جامیعەی میسر. " ئارتوور کریستین سن" مامۆستای زانکۆی کۆپنهاک ( دانمارک) " دوکتۆر ئێرنێست کۆهتل " سەرۆکی کونینەوەی ئیسلامی مووزەکانی بڕلن ( ئالمان ). " پرۆفسۆر هانری ماسە"ی فەڕانسەوی . " دوکتۆر مایر"مامۆستای دەستکردەکان و مێژووی ڕۆژهەڵاتی نزیک لە زانکۆی ئوورشەلیم (فەلەستین) " محمد حبیب " مامۆستای مێژوو لە زانکۆی عەلیگەر، نوێنەری هیند، " پرۆفسۆر مینوورسکی ". " پرۆفسور

هروزنی " نوێنەری چەکۆسلەواکی .

باوکی جەمیل سیدقی یانی " مەلا محمدی مفتی زەهاوی " زانا و عەللامەی سەردەمی خۆی بووە . " معروف رصافی" شاعیری گەورەی عێراق سەبارەت بەتەبع و قەریحەی شیعری عەرەبی "مفتی" دەڵێ: تەبعی من و جەمیل سیدقی لە حاستی تەبعی مفتی گەورەدا وەکی دڵۆپەیەکە لە بەرامبەری دەریادا ، بەڵام " مفتی" ئەوەندە خەریکی نووسین و تۆ ژینەوەی بابەتی زانستییە کە دەرفەتی شیعر دانانی نیە .

مفتی زەهاوی لە سەرەتادا لە شاری سلێمانی عێراق تا چەند ساڵ خەریکی دەرس گوتنەوە بووە و کەم کەم کاری گەورەتری پێ ئەسپێردراوە و لە لایەن دەوڵەتی عوسمانی و سوڵتانی ئەوساوە کراوە بە مفتی تەواوی عێراقی عەرەب و ئەم پلە و پایەیە لەو کاتەدا لە رادە بەدەر گرینگ بووە و پایەو مەقامێکی لەوە بەرزتر لەو عەسرەدا نەبووە .

خوا لێ خۆشبوو " حاجی ملک اکلامی کردستانی"(٥) کە لە شیعر و پەخشانی فارسیدا پلەیەکی بڵێندی هەبووە و هی وەکوو " ملک الشعرای بەهار" ( ٦ ) و بەر لەویش " ئەدیب الممالک فراهانی" (٧) دانیان بە مامۆستایەتی و بەرزی پلەی ئەو داهێناوە لە سەیاحەتنامە رەوانەکەی خۆیدا ئاوا دەنووسێ :

" لە شاری بەغدا بە زیارەتی مفتی زەهاوی نایل بووم و لە مەحزەری دەرس و ئالقەی وەعزەکەی حازر بووم ،ئەلحەق هاوتای مفتیم لە عیلم و زانست و فەلسەفە و فەساحەت و بەلاغەت و کەمال لە تەواوی وڵاتانی ئیسلامیدا چاو پێ نەکەوتووە "

مفتی لە زانستی ریازیاتی قەدیم حیکمەت و کەلام و مەنتیق ، فنوونی ئەدەب و فقە و ئوسوولی تەفسیر وحەدیس و زانستەکانیتری سەردەمی خۆی پڕ **بوو** و هاوشانی زۆر کەم بووە . جەمیلی کوڕیشی کە یەکێک بووە لە فیلسووفانی هاوچەرخی رۆژهەڵات ، تا ئێستا دیوانی شیعر و کتێبە فەلسەفی و ئەدەبی و زانستییەکانی ئەو چەندین جار لە چاپ دراوە و بڵاو کراوەتەوە .

لە دوایدا هەندێ لە شیعرە فارسییەکانی جەمیل و مفتی بۆ نموونە دەخەینە بەر چاو .

لە شیعرەکانی مەلا محمد فیض

نه همین جای زحل بالاتر است از مشتری
میدهد هر نحس را بر سعد گردون برتری

دلجوشدلز زنگ کثرت صاف وحدت نقدا وست
شیشهٔ مارا صفای خویشتن باشد پری

تو نه اوئی و نه بی اوئی اگرمیجوئیش
بایدت از خویشتن هم بگذری هم نگذری

تو مثال سایه‌ای و او مثال آفتاب
هر قدر کز خویشتن خالی شوی از اوپری

دختر زر هست عقل آدمی کابین او
گشته محروم از وصالش زاهد شهر ازخری

امتی را زاهد ابله بخود دعوت کند
شخص واحد گشته هم گوساله و هم سامری

* * * * *

خورشید هدی از افق مکه چو تافت
وان پردهٔ ظلمت جهالت بشکافت

خلقی ز پی یافتن حق بشتافت
عابد هو، عارف انت ، عاشق انا یافت

لە شیعرەکانی جەمیل سیدقی

بی رقیب اندر جهان دلدار کو؟
اندر این گلشن گل بیخار کو؟

گر فکند از رخ نقاب آن آفتاب
دیده‌ها را طاقت دیدار کو؟

شیاوی باسە کە بە بۆنەی چل رۆژ تێپەڕبوون بە سەر کۆچی دوایی " جەمیل سیدقی " لە شاری بەغدادا لە رۆژی٢٧ی مانگی مایسی ١٩٣٧ ئاهەنگێکی زۆر گەورە گیراوە . پیرە مێردیش (٨) لەم ئاهەنگەدا بەشدار بووە و بە عەرەبی شیعرێکی گوتووە و خوێندوویەتەوە و لە کاتی خویدا لە رۆژنامەکەیدا بەناوی " ژین "(٩) هەڵبەستەکەی بە عەرەبی و بە کوردی بڵاو کردۆتەوە . لە دوایدا گوڵبژێرێک لە شیعرە کوردییەکە بۆ نموونە دەنووسین .

باوەڕ ئەکەم کەگیانی بڵند نامرێت و ئەژی
بڕوانە ئاسمان بووەتە پەلکی زەرد و سوور

شادم بە مەیلەوە یادی ئاوارەییم ئەکەن
کاک جەمیل بەیادی جەمیلت بوو کەشیعرم هات

جاران بە خەو بوو ،ئێستە بە دیمانە هاتە دی
گیانی زەهاوییە کە ئەدرەوشێتەوە لە دوور

دیارەبە قەدری خوێندنەوە بەرز ئەبێت وەتەن
راوەستە زۆری نەماوە کە منیش بێمە لات

# فریشتەکەم !

عەزیزی ئالی

فریشتەکەم !
شەوانە بێ حیکایەتی خەیاڵی تۆ
نەبانە خەو لە چاوی من
کە تۆ نەبی هەواری داغی حەسرەتە
– جەهەندەمە هەناوی من

گوڵووکی من !
کە تۆ نەبی ،کرانەوەی گوڵی بەیان
– چەمۆڵەیەکە دڕکی خەم دەناخی سینە ڕۆدەکا

کە تۆ نەبی،
ژیانی من شەوی بەسامی مێشەیە
دە هەڵمەیە
لە شەو گەلێ دەترسم ئەی هەتاوی من !

---

.... پاشماوەی حاجی ریوی

بۆ نوێژیان وەخەبەر دێنم ، بۆ کاسبییان وەخەبەر دێنم ". ڕێوی گوتی: " زەریفە ، ئەو عوزرەت لێ قەبووڵ دەکەم ، ئەمما ئەتۆ زۆر بێشەرمی لە پێش چاوی بەنی ئادەمی سواری مریشکی دەبی ، شەرمی لە شای ناکەی کەڵەباب دەستی بە قسان کرد ، ڕێوی توند بە ئەستۆیدا نووسا ، خنکاندی و خواردی ، دەم و لووتی خۆی ئەستری ، بانگی مراوی کرد. مراوی لە ترسان هاتە پێشێ . ڕێوی گوتی: " مراوی ئەتۆ بۆ لە بەحراندا هەر چێشتی خۆش دەخۆی گوێ نادەیە کەس ؟". مراوی لە ترسان لەرزی ، لەسەر ڕا بە عەرزیدا کەوت . ڕێوی ئەویشی گرت خواردی. زاری کونەکەی گرتەوە ، نەیەلێ ئەوانی دیکە بڕۆن . بانگی پەپووسلەمانکەی کرد ، گوتی :" وەرە ، سەرگوزەشتێکم لە حیکایەتی سولەیمان پێغەمبەری بۆ بگێڕەوە ، ئەتوو زۆر خزمەتی ویت کردوە". پەپووسلێمانکە لە ترسان هاتە دەرێ . ڕێوی گوتی :" ئەتوو ئەو تاجە چیە لەسەری خۆت ناوە ، مەگەر ئەتوو پاتشای یا وەزیری؟ درۆیان دەکەی ، دەڵێی ئەمن زۆرم خزمەتی سولەیمان پێغەمبەر کردوە". گورجێکی گرتی و خواردی .

بەری بەیانێ بوو ، ڕێوی زۆری برسی ببۆوە ، بانگی قشقەڵەی کرد ، گوتی: " وەرە پێشی ". قشقەڵە لە ترسان هاتە پێشێ . ڕێوی گوتی : " ئەتۆ بۆ چی زەرعاتی خەڵکی دەخۆی،وهێلکەی ئەوان دەدزی ؟ مەگەر خەڵکی کاسبی بۆ تۆ دەکا ؟" قشقەڵە گوتی :" ڕاستی گوناهم زۆرە ئەمما ، لە ڕێی خزمەتێوە شتێکت پێ دەڵێم ، لە پاشان کەیفی‌خۆتە" ڕێوی گوتی : " بڵێ بزانم ". قشقەڵە گوتی:" کەڵەباب و مریشکێکم پێ شک دێ لە زەمانی حەزرەتی ئادەمیەوە ماون هەتتا ئەوڕۆ. ئەگەر ئیزنم بدەی،دەچم بۆتیان دێنم ، لە پێشدا ئەوان بخۆ ، لە پاشان ئەمنیش بخۆ". ڕێوی گوتی: " زەریفە زۆرم برسی یە ، زوو وەرەوە ئەگەر بێی ئەو کارەی بکەی ، ناتخۆم". قەل ڕۆی چۆە دێیەکی . سبحەینەی زوو بوو دوو سەگ لە حەسارێکیدا گەپیان دەدا ، خۆی بە سەیەکان نیشان دا سەیەکان ڕەدووی کەوتن . بە قەستی زۆر بە قندە قندەدەڕۆی. هەتتا وەدووی کەوتن هێنانی هەتتا گەیشتنە ڕێوی یێ قەل ئیشارەتی کرد لە ڕێوی‌یێ، گوتی : " ئەوەتان". ڕێوی کە سەگەکانی دی دەستی هەڵوەشاند ، گوتی : قبووڵە ، مەیان هێنە پێشێ . قشقەڵە بەقسەی نەکرد ، ڕێوی بە سەیەکان نیشان دا ، سەیەکان وەدووی کەوتن ، ڕێوییان کوشت تۆڵەی ئەو دەعبایانەیان لێ کردەوە . بۆیە وێستا ڕێوی ئەگەر سەگی تێبەردەدەن ، دەستی هەڵدەوەشێنێ .

---

( پەراوێز )

١) – زورا : هەم بە مانای شاری بەغدایە و هەم مەبەست لە گۆڤاری "الزوراء "ە کە جەمیل سیدقی لە سەردەمی خۆیدا بڵاوی کردوەتەوە .
٢) – بە حیسابی ئەبجەد دەبێتە ١٣٥٤ی کۆچی‌کەساڵی وەفاتی‌جەمیل سیدقی‌یە
٣) – ١٨٦٣ – ١٩٣٦ ی . ز
٤) – ١٧٩٢ – ١٨٩٠ ی . ز
٥) – حاجی ملک الکلامی کوردستانی : ناوی عەبدولمەجید و کوڕی میرزا عەبدوالکەریمە ، خەڵکی سەقزی ئێرانە ، ناز ناوی شیعری " مەجدی " یە و ناصرالدین شای قاجار سەبارەت بە بەرزی پلەی شیعری فارسی لەقەبی " ملک الکلام" ی پێدا .
٦) – ١٢٦٦ – ١٣٣٠ ی . هـ
٧) – ١٣٣٠ – ١٢٧٧ ی . هـ
٨) – حاجی تەوفیق بەگ ١٩٥٠ – ١٨٦٧ ی . ز
٩) – ژین : حەوتەنامەیەکی ئەدەبی بوە کە لە لایەن پیرەمێرد و لە دوای ئەو لە لایەن جەمیل سائیب ، نووری ئەمین ، مەحموود و ئەحمەد زرنگ ، و گۆران بڵاو کراوەتەوە. هەوەڵ ژمارەی لە ٢٦ی کانوونی دووهەم دەرچووە و تا ساڵی ١٩٦٣ بەر دەوام بووە .

## بەزمی

## نەورۆز : ئەحمەدی خانی

وەقتێ وەکوو شەهسەوارێ خاوەر
تەحویل دکر د ماهێ ئازەر
یەعنی کو دهاتە بورجێ سەرسال
قەت کەس نەدما د مەسکەن و مال
بیلجوملە دەچوونە دەر ژ مالان
حەتتا دەگەهیشتە پیر و کالان
رۆژا کو دەبوویە عەیدێ نەورۆز
تەعزیم ژ بۆ دەما دل ئەفرۆز
سەحرا و چەمەن دەکرنە مەسکەن
بەیدا و دەمەن دەکرنە گولشەن
خاسما عەزب و کچێ د باکر
ئەلقیسە جەواهیرێ د نادر
تێکدا د موزەییەن و مولەبەس
ڤێکرا ل تەفەروجێ مورەخەس
لاکن نە بە توهمەت و بە میننەت
بەلکی ب تەریقا شەرع و سوننەت

## بەهار : مەولەوی

وەهارەن ، سەوزەن ، ئاوەن ، سەرکاوەن
هاژەی وەفراوەن ، شاخەی شەتاوەن
ساقی یەن ، بادەن ، نەسیمەن ، بادەن
بولبول جە دەوری گوڵان ئازادەن
بەزمەن ، شادی یەن ، عەیشەن ، نیشاتەن
کەیفەن ، شۆخی یەن ، شەوقەن ، حەیاتەن
سەنگەن ، کۆسارەن ، سەرکۆوەن ، هەردەن
خەمەن ، مەینەتەن ، زووخاوەن ،دەردەن
هیجرەن ، دووری یەن ، عیجزەن ، فیراقەن
واوەیلاو شینەن ، ناڵەی عوشاقەن
سەبزەن ، سۆسەنەن ، نەورۆز گوڵانەن
کەمەرەن ، هەردەن ، ملەن ، کەلانەن
سەرعی یەن ، شەیدان ، نەجدەن ، مەجنوونەن
مەزاقەن ، جامەن ، پیاڵەی هوونەن

## نەورۆز : وەفایی

نەسیمی بادی نەورۆزی شەمیمی عەبهەری هێنا
بەریدی عاشقان دیسان پەیامی دلبەری هێنا
نەوید ئەی عاشقانی دڵفگار یار هاتە سەر خەندە
سەلا ! ئەی بولبولان دیسان درەختی گوڵ بەری هێنا
مەگەر رێی کەوتە زولف و رووی حەبیبم بادی نەورۆزی
حەیاتێکی بە دنیا داوە بۆ گوڵ عەنبەری هێنا
بە فەتحی دڵ دەڵێی یار زولف و سینە و رووی‌وەدەرناوە
لە نەسرین و گوڵ و سونبول بەهار هات شەککەری هێنا
دەڵێی چاوی منە هەوری بەهاری دەمبەدەم دەگری
دەڵێی ئاهی منە بەرقی درەخشان ئاوری هێنا
هەوا چوو پڕ بە دامانی دەرو دەشتانی گوڵ کێشا
سەبا هات پڕ بە جیبی کۆهساران عەنبەری هێنا
لە نێو بەزمی وەنەوشەی جۆکەناران لالە پەیدا بوو
بە تاریکی ( خضر ) بۆ چەشمە شای ئەسکەندەری هێنا
کە ئیسلامی بەهار فتوای جهادی کافری دەی دا
سنەوبەر نێزە گوڵبون گورز و سووسن خەنجەری هێنا
نیگارستان بە پا ئەندازی سوڵتانی بەهار هاتن
سەمەن دیبا ، شەقایق ئەتڵەس و گوڵ مەجمەری هێنا
لە شادی دارە گوڵ مەسنەد نشین بوو هاتە پشکووتن
چەمەن تەخت و زومورڕەدگوڵ لە یاقووت ئەفسەری هێنا

# بەهار

## بەهاری پاش باران

گۆران

وشکه چەم وەک جەوری سەردەم هەڵساوە،
هەر هێڵێ گاسنی وەردی کێڵاوە
بەرگی سەوز و نەرمی بەهار ژاکاوە
جووتیاری نەقیزەی درێژ سەرشان نەر
هەتا چاو بڕ ئەکا جۆگەلەی ئاوە
تا ئەژنۆ لە قوڕداو کەپەنک بەسەر،
بەرەو ماڵ لەقە ـ لەق گای داوەتە بەر!
مامەی شوان،وەکوو خۆی ، بەرخی باوەشی
بۆ رانی تەڕیوی هەڵپە و خەم لەبەر،
کچانی کۆڵە گیای کولاندن بە کۆڵ
تەڕ ـ تەڕە و هەڵ دەستێ هەڵمە لەشی لێ
لە ئاو هەڵکشاوە پەل و پۆی باڵدار
رووەو دێ رەویون وەک مامزی چۆڵ.
تەلانی ناو باخی پڕ فەرشی گیای سەوز
رەنج ئەدا فڕە ـ فڕ ناگاتە سەردار.
لە لێواری حەوزا گوڵاڵە و بەیبوون
(لێڵاو)ی بارانا و کردوویە بە حەوز،
درەختی هەڵووژەی بەفر داپۆشیو،
ساوان و ئەلەرزن لە تاو نوقوم بوون،
هەڵاڵەی وەراندوون تەوژمی باران،
دار ستێوی رازاوە بە پۆلانەی زیو،
لەبەر پێی نەمامی چوالەدا سەوزاو،
وەک بووکی رووت کراو کەوتوونە گریان!
گوڵباخی گەشاوەی گەڵا تێک شکاو
لە روومەت تکاوە رژاوەتە ئاو.
وەک یاری شەرمنی دەس لە مل ئاڵاو
بە کولمیا دێتە خوار ئاوەق لە گوڵاو،
ئەمەیە دیمەنی پاش وەشتی نیسان :
بە گوێچڕ دەرباز بووی شانەوقز شێواو .

*****

تا هەوری رووی ئاسمان دڕئەداو هەتاو
بێ شێلی ستەمە گشت شتێکی جوان،
ئارامیی شیرینتر ئەخاتەوە ناو ...

---

لە بەزمی نێرگس و نەسرین بە دەفعی چاوەزار ئیمڕۆ
دڵ ئایەی ( ان یکاد ) ی بۆ قەد و ناڵا و سەری هێنا

لە مەیخانەی چەمەن بەزم و تەرەبیان گرتوە مەینۆشان
شەقایق بادە نەسرین کووپەیمەی ئەحمەری هێنا

لە دەنگی ساز و چەهچەی بولبولان سووتا هەموو دنیا
سەدایی تارەزەن ئاوازی خۆشخوانی ئاوری هێنا

حیکایاتی غەریبەی پێیە بولبول جوملە خۆ کردی
دەڵێی چاپاری ئێران رۆژنامەی ئەختەری هێنا

بەشەوقی رووی لالە و گوڵ لە باخان وا چراخانە
دەڵێی ریزوانە بۆ ئەهلی بەهەشتی کەوسەری هێنا

شکۆفە و گوڵ بە عیشوە و خەندە ئارامی دەروونیاندا
بەهار بۆ خەستەگانی خۆی چەشیر و شەکەری هێنا

بە زەرد و سوورەوە خەملیوە بۆ داماوی بولبول گوڵ
وەرەق میعجەر ئەرز گوڵگوونەشەونم زیوەری هێنا

هەموو کەس چاوەروونی لێک دەکەن وەک سورمەیان دیبێ
مەگەر بادی سەبا خاکی گوزاری دڵبەری هێنا

چ دلبەر ئافتابی و ماهڕوویان و شەکەر لێوان
کە خەندێکی لە سەحرا گوڵ لە دەریا گەوهەری هێنا

بە بێ شاباشی سەر بە قسەی ( وەفایی ) گوڵ چراغ نابێ
کە بولبول گیانی بۆ گوڵ برد وپەروانەش سەری هێنا

# خولاّ لە سوڵتان مەحموود گەورەترە

## چیرۆک بۆ منداڵان

لە توحفەی موزەففەرییە وەرگیراوە

پیاوێکی ئاوفرۆش لە شاری غەزنەیدا ئاو فرۆشی دەکرد، خولاّ وای بۆبڕیبۆوە کە هەموو رۆژێ تمەنێکی پەیدا دەکرد. شەوێ دەهاتەوە ماڵە خۆی، هێندێکی برادەر بوون، بۆ وانی خەرج دەکرد، شەوێ لە ماڵە وی خەریک بەزمی دەبوون، قەدەر ئەییامێکی وای رابوارد، شەوێکی سوڵتان مەحموود دە شاری غەزنەیدا دەگەڕا، هاتە ئەو کووچەی، گوێی هەڵخست، تەماشای کرد : دەنگی گۆرانی و تار دەهات. بە جلکی دەروێشی چۆوە ژوورێ. سەلاوی کرد، ساحب ماڵ جێی پێ نیشاندا، دانیشت، بەخێراتنی کرد. قەدەرێکی دانیشتە خەڵقەکە بڵاوەیان کرد، سوڵتان مەحموود فکری کردەوە، لە دڵی خۆیدا گوتی : " ئەو پیاوە ئاوزەی ماڵیی هیچ نیە، ئەو بەزمەی لە چی دروس کرد؟ ناڕۆم هەتتا نەزانم، لە کوێی بووە ". خۆی داگرت، نەڕۆی. خانە خوێ گوتی : " دەروێش ئەتۆ بۆ ناڕۆی ؟" گوتی : " بابە، ئەمشۆ میوانم، لێرە زیاتر چ جێم نیە ".

ساحب ماڵ گوتی : " دەروێش، قەیدی نیە ئەوشۆ لێرە بە ". سەعاتێکی پێچوو، پرسی : " خانە خوێ بە خولاّت سوێند دەدەم! ئەو خەرجەت لە کوێ پەیدا کردوە؟ ئەمن دەبینم ئەتوو هیچت نیە ". گوتی : " دەروێش، بنوو، لەو قسانە گەڕێ ". زۆر پاڕاوە لە ساحب ماڵی، گوتی : " دەروێش، ئەمن هەموو رۆژێ ئاو فرۆشی دەکەم، تمەنێکم وەگیر دەکەوێ بۆ رەفیقان خەرجی دەکەم، هەموو شەوێ حاڵم وایە وەکی دەبینی ". دەروێش گوتی : " ئەگەر سوڵتان مەحموود حوکمی بکا کەس ئاوی نەفرۆشێ چدەکەی؟" گوتی : " دەروێش خولاّ لە سوڵتان مەحموودی گەورەترە، بنوو ". دەروێش نوست تا سبحەینێ.

سبحەینێ زوو روی چووە سەر تەختی، حوکمی کرد : " ئەمڕۆ کەس ئاوی نەفرۆشێ ". جاڕیان لە شاریدا کێشا، کابرا گوێی لێ بوو، قسەی دەروێشی وەبیر هاتەوە، گوتی : " ئەو دەروێشە شەیتان بوو ". چوو لە ماڵێ، گوریسێکی هەڵگرت، خەریکی حەمباڵێ بوو. ئەوی رۆژێ دیسان تمەنێکی پەیدا کرد، شەوێ بۆ رەفیقان خەرجی کرد. سوڵتان مەحموود دیسان، هاتەوە سەلاوی کرد. ساحب ماڵ بەخێراتنی کرد، دانیشت. پاش قەدەرێکی خەڵقی رۆین، گوتی : " دەروێش بۆ ناڕۆی ؟". گوتی: " چ جێم نیە بیچمێ، ئەمشۆش لێرە دەبم ". دیسان دەروێش پرسی : " ئەمڕۆکە سوڵتان مەحموود بیستم حوکمی کردوە، کەس ئاوی نەفرۆشێ، ئەتوو خەرجی ئەمشۆت لەکموێ بوو؟". ساحب ماڵ گوتی : " دەروێش، وەک قەلی دەقڕی، ئەمن شەوی دیم پێ گوتی: خولاّ لە سوڵتان مەحموودی گەورەترە ". دەروێش گوتی : " ئەگەر سوڵتان مەحموود حوکمی بکا کەس نابێ حەمباڵی بکا، چ دەکەی؟". گوتی: دەروێش خولاّ لە سوڵتان مەحموودی گەورەترە ". دەروێش نوست حەتتا سبحەینێ. سبحەینێ زوو رۆیەوە سەرتەختێ جاڕیان رایەشت، کەس نابێ حەمباڵی بکا. کابرا زۆر مات بوو، هیچ کاسبی دیکەی نەدەزانی، مەحتەل بوو تا ئێوارە هیچی وەگیر نەکەوت. جلی بێکاڕی لە ماڵی بوو دەبەری کرد، هاتە سەر کووچەی، راوەستا، تەماشای کرد، دوو لادێیی شەڕیان دەکرد. خۆی لێ کردنە داروغە، چوو، دوو سێ داری لێ دان گرتنی، گوتی : " دەتانبەمە کن سوڵتانی ". پیاوەکان ترسان، گوتیان: بابە، دوو تمەنت دەدەینێ، مەمانبە کن سوڵتانی ". دوو تمەنەکەی لێ وەرگرتن، چووە ماڵێ خەرجی کرد. شەوێ سوڵتان چۆوە دیتی بەزمی ئەمشۆ لە هەموو شەوان زیاترە، چۆوە ژوورێ دانیشت، تا درەنگێکی پرسی: " رەفیق ئەمڕۆ بیستم سوڵتان حوکمی کردبوو، هیچ کەس حەمباڵی نەکا، خەرجی ئەمشەوەت لە کوێ بوو؟". گوتی : " زۆر بەدفەڕی، ئەتۆ چت بەسەر ئەو قسانە داوە؟". گوتی : " دەروێش، حیکایەتی وابوو ". دەروێش گوتی : " ئەگەر سوڵتان

سبحەینێ بت باتە کنە خۆی شیرێکی لە قەدت بەستێ ، تا ئێواری چ دەکەی؟" گوتی: " دەروێش ، سولتان چی بەسەر ئەمن داوە؟". دەروێش گوتی :" بەڵکی لە دووی ناردی ". ئەوێشەوێ نووست . سبحەینێ هەڵستا ، رۆیەوە سەرتەختی دانیشت ، پیاوی نارد کابرایان هێنا شیرێکی لە قەدی بەست ، رای گرت تا ئێوارێ . ئێوارێ کابرا خۆی دزیەوە ، شیرەکەی بردە کن شیرگەرێکی ، گوتی : " وەستا شیرێکی دارم بۆ دروس بکە ، ئەو شیرەش گرۆیبیس تمەنی بێ ، حەتتا سبحەینێ پوولت دەدەمەوە ". پوولەکەی لێ وەرگرت جوو خەرجی کرد ، ئەوێ شەوێ میوانییەکی چاکی دروس کرد . سولتان مەحموود ئێوارێ رۆی بۆ ماڵە کابرای گوتی :" بزانم ئەمشۆ چی هەیە بیدابە میوانان". رۆی تەماشای کرد مەجلیسی ئەوێ شەوێ لە هەموو شەوان خۆشترە . سولتان سەرسام بوو ، خەرجی ئەوشۆی لە چی پەیدا کردوە . رۆیە ژوورێ ، سەلاوی کرد ، ساحب ماڵ گوتی: " وەدەریی بنێن ، زۆر بەدفەرە ، هەموو شەوێ سەدەقەم لێ دەدا ، هەرچی ئەو دەڵێ وام بەسەر دێ ". دەروێش زۆر پاراوە . دانیشت هەتتا شەو درەنگ بوو . خەڵقی رۆین ، دەروێش بەجێما . ساحب ماڵ گوتی : " دەروێش برۆ" . دەروێش گوتی: "ئەگەر برۆم حەسەسان دەمگرن". گوتی: " قەیدی نیە ، هەرچی ئەتۆ بڵێی چاترم بۆ دێ" . دەروێش گوتی : " بیستم ئەمڕۆ سولتان ئەتۆی بردبوە کنە خۆی ، تا ئێواری لەوێ بووی خەرجی ئەمشەوەت لە کوێ پەیدا کرد؟". حیکایەتەکەی بۆ گێراوە دەروێش گوتی :" ئەوێستا شیرەکە دارە ئەگەر سولتان سبحەینێ بتباگونابار ـ ێکی بێنێ ، بڵێ سەری ببڕە چ دەکەی؟ گوتی : " دەروێش ، بنوو ، خولا لە سولتان مەحموودی گەورەترە". سبحەینێ دەروێش رۆیەوە سەرتەختی ، گوتی: " بچن فولانکەسی بێنن". چوون هێنایان . دایانە دەست ئاوفرۆشی ، کە سەری ببڕێ . سولتان چاوی لێیە ، کابرا گوتی : " یا رەبی! ئەو پیاوە ئەگەر گوناباری ئەو شیرە سەری ببڕێ، ئەگەر گوناباری نیە شیرەکە ببێ بەدار".شیری دەرکێشا ، لە ئەستۆی کابرای دا نەیبڕی شیرەکە ، ببوو بە دار. ئاو ـ فرۆش بە سولتانی گوت : " قوربان،ئەو پیاوە گوناهی نیە، بۆیە شیرەکە بوو بەدار". سولتان زۆر پێکەنی ، خەڵاتی کرد ، وە کردی بە نۆکەری خۆی .

دەسکێک گوڵ دەسکێک نەرگیز
مەرگی ئەوجەماتەی نەبینم‌هەرگیز!

---

.... پاشماوەی بووکی ...

چەند رۆژ پاشی ماڵی ئێمە و کاک شەهاب و رەفیقانیتری باپیر و پەری بۆ خەنەبەندان بانگ هێشتن کرابووین شەوێکی زۆر خۆشمان رابوارد.باو باوی نێرگس بوو وەک کەوی شەرانی پەربازی لە دەورەی پەری دەکرد و دابوویە بەر هێرشەلاتاو و تەوس و پللار. پەری دەستی لە بەر نەدەکردەوە رۆژی پێنج شەمۆش هەموو لە ماڵی بووکی بووین . نێرگس وەک خول خولە هەڵدە ـ سووڕا و پەزێرایی لە خەڵک دەکرد و جارجارە چەپۆکێکی بە پەرێدادەدا یا چەمۆڵەیەکی لێ دەنا و هەمووماني وە پێکەنین دەخست ، لای بانگی شەوان تارای سووری جغجغەداریان بە سەر پەریدا دا و بووکیان سوار ماشێن کرد و بە داب و دەستوورێکی کوردانە و موحتەرەمانە بەرێمان کرد .

ئێوارەی جومعە بوو و ئیدارە نەبوو لە ماڵێ دانیشتبووم و تەما ـ شای تەلەزیۆنم دەکرد لە پڕ کرمەهۆڕ پەیدا بوو و تۆز و خۆڵ بەری ئاسمانی کرت . هەواپەیماکانی بەعسی شارە خونچیلانەکەمانیان دابوە بەر راکیت و بۆمب . ئێمە بە پەلە خۆمان لە ژێر زەمین هاوێشت هاڕە و زرمەی فڕۆکەی دوژمن و تەقەی دەسڕێژی دژی هەوایی خومان زراوی دەتۆقاند و گوێی کەڕ دەکرد . وەک رۆژی قەرە وەیس باب ئاگای لە کوڕی نەبوو. پاش‌نیو سەعات کە هاتمە دەر دووکەڵە شینکە بەری لە هەموو لایەکی شار هەڵدەستا و لەبەر بۆنی باڕووت و تۆز و خۆڵ پشوو هەڵنەدەکێشرا . بە تاڵووکە خۆم گەیاندە ماڵی کاکە سوار دیار بوو سەدەمەی نەدیبوو . بەڵام دەرکی داخرابوو کەس لە ماڵ نەبوو، بە نێو خەڵکی سەر لێ شێواو و چاو بە گریانا بە غاردان چوومە ماڵە موهەندیس پیرانی بە داخەوە خانوە تازە و جوانەکەی ئاداری بە سەر پادارەوە نەمابوو. کاک شەهاب و نێرگس و دێد ـ ئەستی و باپیر لەحاڵێکدا بانگ لەسەر بانگیان لێ‌دەدا ، خەریکی لابردنی خشت و بەرد و گڵ بوون منیش وەک وان لە گابۆرم داو خەریکی کار بووم وردە وردە خەڵک هاتە یارمەتیمان لە لای نیوەشەودا جەنازەی زاوای تازە و بووکی بەکشەوەمان لە بن خاک وخۆڵ دەرێنا .

شەماڵ هات بە گاڵە گاڵ
هەور بوون گەواڵ گەواڵ
پشکووت گوڵی گەش و ئاڵ
بلبل کەوتە ناڵەناڵ

بە لەنگێزە ، بە باران
بە شنە بای بەهاران
توانەوە وەک جاران
کەوی بەفری نیساران

نەما مژ و سەرما و سۆڵ
نەسیخوار ما نە سەهۆڵ
تەرت و رژد و شیو و دۆڵ
لێی هاتە دەر گیا و گۆڵ

دەشت و چیمەن رازاوە
کێو و بەندەن نەخشاوە
زۆنگ و چێنکە ژیاوە
گیا سەری پێوە ناوە

لە هەوشین و گەدە و لەند
لە کوێستانی دە سامرەند
هەڵز و بیزا و گیابەند
تێک چرژا ، بۆتە زەمەند

مەندۆک و خاو و کەما
لە نەرمان و ئەستەما
بە سروە هاتنە سەما
وەیشوومە و سەرما نەما

وێستاوە زەنگۆڵ زەنگۆڵ
ئاونگ لە سەر پەلکی گوڵ
لەسەر چلێ سورە گوڵ
بلبل دەخوێنێ بە کوڵ

دیسان لە چیاو لە رازان
دێ سیرەی سەقر و بازان
پێم خۆشترن لە سازان
لە ئاهەنگ و ئاوازان

بژوێنە هەموو وڵات
زیندوو بۆتەوە ماڵات
جەنگەی بانەمەڕێ هات
بەرە و کوێستان چوو خێڵات

دیسان هات وەکوو جاران
هەوهەوی شۆڕە سواران
وڕەی جلیت و داران
خرمەی ناڵ و بزماران

هات خربنگەی زەنگ و قۆڕ
لوشمە لوشم و هۆڕەهۆڕ
هۆقەهۆق و بۆڕەبۆڕ
حیلەی جانوو ئەسپی تۆڕ

کار و کووری بزن و مەڕ
لرفە لرفی لۆک و نەڕ
کۆڕژنی ئەسپی بەدفەڕ
گوێچکەی پیاوی دەکا کەڕ

وەنەوشەی جوانی خۆشبۆ
هاتە دەر لە لێوی جۆ
دار دەری کردوە چرۆ
کەروێشکەی کرد گەنم و جۆ

سوێسن و بەیبوون و شللێر
رواون لە جێگای زەنوێر
قەڵبەزی بەست ئاوهەڵدێر
شەپۆلان دەدا ئەستێر

بۆنی خۆشی هەڵاڵە
پیاو مەست دەکا لە نواڵە
وەک شەهیدە گوڵاڵە
لە خوێناوا شەڵاڵە

گرمەی هەوری بەهاران
دێ بەیان و ئێواران
خوناوی وردە باران
تەڕ دەکا گەڵای داران

ئەو تروویک و نشیوە
ئەو یاڵ و خڕ و شیوە
لە گوێن بەهەشت خەملیوە
کێ مەڵبەندی وای دیوە؟

تیرەک و گەوە و لاپاڵ
پێی دا دا ئاڵای ئاڵ
سەرچاوەی سارد و زوڵاڵ
هەڵقوڵێ وەک زیوی قاڵ

هات لە رەوەز و زەردان
قاسپەی کەوی سەر بەردان
ورتە ورتی هەوێردان
دێ لە ناو شیناوەردان

لە کن کارژیلە و بەرخەل
لە کن بزن و مەڕی شەل
کە بۆیان هەڵکەوێ هەل
کچ و کوڕ دەکەن هەمزەل

کیژۆڵەی شۆخی جوان چاک
شۆڕە ژنی داوێن پاک
رووهەڵمالاو و بێباک
دەڕەتێنن زاووماک

فیتەی شوان ، ئۆحەی گاوان
دێ لە مۆڵگە ودەراوان
دێتە گوێ لاوکی لاوان
بالۆرەی بەڵەک چاوان

منداڵ لە رژد و هەڵدێر
بەر دەدەنەوە تاوێر
شوانە لەسەر بردەبێر
تێی تووڕاندوە لە بلوێر

مەڕ لە گوشتا بووە سوور
خۆ هەڵداوێن شەک و کوور
گەماڵ دەکەن چەق و لوور
سەوەڕیان دەچێ بۆ دوور

کچی لەباری رەوەند
هەڵیکرد بەلەک و زەند
کەزی هۆنیەوە وەک بەند
کوڕان دەگرێ بە کەمەند

لەبەر دەرکی رەشمالان
دەبینی چاو کەژالان
دڵان دەبەن بە تالان
کاس دەکەن کوڕ و کالان

لێو ئاڵن ، دەم بچووکن
خوێن شیرن ، رەزاسووکن
کوڵمەیان وەک گوڵووکن
گەورە کچن ، نۆ بووکن

شل و مل و لەبارن
چاو بەکل گوێ بەگوارن
دەسماڵ پووڵەکەدارن
شەدە و گێل گێلەلارن

ناسک و نەرم و نۆڵن
خاوێنن سپی و سۆڵن
بڵباسی و توند و تۆڵن
بەمژۆڵ جەرگان دەکۆڵن

هەڵیان ماڵیوە باسک
باسکی قەڵەو و ناسک
کە دەکەن تاسکە تاسک
رەوکترن لە ئاسک

کیژی مەرزینگ و سەکرن
بە لەنجە و لار رادەبرن
ناز دەکەن ، چاو دادەگرن
کوڕگەل دەبەریان دەمرن

کابانی قۆڵ بە بازن
شەنگە بێری کێل گەردن
لە نێو مەڕ دێن و دەچن
وەک پۆلی پۆڕان دەچن

سوێسن وەنەوشە و هەمین
کەژێ و خەندان و جەمین
خاسێ ، کەوێ ، خاتووزین
بەپۆل دەچنە مەڕ دۆشین

زیڕن و کابان و مێرێ
دانیشتوون لە بەر بێرێ
ئەستێ دەکا هاوێرێ
گوڵێ بەرخان دەژمێرێ

خونچە و گوڵووک و گەوەر
شەم و کەژاڵ و دڵبەر
زێن و مروێت و ئەسمەر
لە تاولێ هاتوونە دەر

مامز دایگرتوە شیری
ناسک دەکوشێ پەنیری
ناز دەشێلی هەویری
کالێ دەکا نان تیری

ئامان چۆتە کولێنێ
پەری مەشکەی دەژێنێ
بەسی لۆرکێ دەکولێنێ
خەیاڵ ئاوردووی دێنێ

( هێمن ) لەسەرە خۆ بە
ئەکەی بچی بۆ هۆبە
دەنا دەشکێنی تۆبە
ئاور دەگری وەک سۆبە

ئاوڕێک بۆسەر مێژووی کوردستان

موهەندیس فاڕووقی کەیخوسرەوی

# سەرداری موسڵمانی کورد صلاح الدینی ئەیوبی

بەشی یەکەم

## ئاوڕێک بۆسەر مێژووی فەلەستین :

ناوی صلاح الدینی ئەیووبی پەیوەندییەکی زۆر نزیکی بە مەڵبەندی فەلەستینەوە هەیە و ئەگەر بمانەوێ باسی ئەو سەردارە بەناوبانگە بکەین پێویستە چاوێک بە مێژووی فەلەستیندا بخشێنین .

فەلەستین وەک بەشێک لە وڵاتانی عەرەبی کەوتوەتە لای ڕۆژهەڵاتی دەریای سپی نێوەڕاستەوە و لە باکوورەوە لەگەڵ لوبنان و لە شەرقەوە لەگەڵ رووباری ئوردون و کۆماری سووریا و لە باشوورەوە لەگەڵ سەحرای سینا ، کە بەشێکە لە وڵاتی میسر ، هاوسنوورە .

یەکەم جار لە ساڵی دووهەزار و پێنسەدی" پ . ز" دا " کەنعانی"یەکان کە چەند هۆزێکی عەرەب بوون هاتنە فەلەستین ، بەڵام زۆری لێ نەمانەوە و بەرەو چیاکانی لوبنان هەڵکشان. ئەم هۆزانە کە لە تاریخدا وردە ناویان بە " فینیقی " گۆڕا چەندین شاریان لە فەلەستیندا ساز کرد و بناخەی شارستانیەتێکیان لەوێ داڕشت و ئاینێکی تایبەت بە خۆیانیان دانا کە مەزهەبی " عیبرانی " یەکان نزیکییەکی زۆری لەگەڵ ئەو ئاینەهەیە.

لە ١٨٠٥ی "پ .ز" دا حەزرەتی ئیبراهیم هاتە فەلەستین و هەر لێرەش حەزرەتی ئیسحاق وحەزرەتی یەعقووبی کوڕی کە " ئیسرائیل" یان پێ دەگوت هاتنە دنیاوە. قەومی یەهوودیش کە دەچنەوە سەر حەزرەتی یەعقووب بە " بەنی ئیسرائیل " ناوبانگیان دەرکردوە. دەور و بەری ساڵی ١٢٩٠ی"پ .ز" حەزرەتی مووسا کە بەنی ئیسرائیلی لە چنگ فیرعەون رزگار کرد ، حەزرەتی یووشع "ی لەگەڵ جەماعەتێک ناردە فەلەستین ، بەڵام دانیشتوانی ئەو مەڵبەندە ئیمانیان بە حەزرەتی مووسا نەهێنا .

لە دوای کۆچی دوایی ئەو حەزرەتە بەنی ئیسرائیل بە رێبەرایەتی حەزرەتی یووشع لە رووباری ئوردون پەڕینەوە و هاتنە شاری " ئیریحا " و لە دواییشدا شارەکانی دیکەی فەلەستینیان گرت . بەڵام شاری قودس " یبووس " خۆی بە دەستەوە نەدا .

قەومی یەهوود هەمیشە لە شەڕ و کێشەدا بوون و پاش کێشەیەکی زۆر ملیان بۆ رابەری شائوول " تالووت " کەچ کرد . شائوولیش لەدوای چەندین شەڕ تێک شکا و هەزار ساڵ بەر لە میلادی مەسیح حەزرەتی داوود سەرۆکایەتی بەنی ئیسرائیلی بە ئەستۆ گرت. حەزرەتی داوود خۆڕاگری دانیشتوانی شاری قودسی تێک شکاندو وڵاتێکی بۆ بەنی ئیسرائیل پێک هێنا و شاری ئوورشەلیمیشی کردە پێتەختی. هەروەها بناخەی پەرەستشگای گەورەی " هەیکەلی سولەیمانی " دانا کە حەزرەتی سولەیمان بە یارمەتی سوڵتانی سوور تەواوی کرد .

پاش کۆچی دوایی حەزرەتی سولەیمان ژمارەیەک لە ئیسرائیلیەکان لە " رحبعام " ی کوڕی هەڵگەڕانەوە و لە باکووری فەلەستیندا " دەوڵەتی ئیسرائیل " یان پێک هێنا و شاری " سامەڕا "یان(١) کردە پێتەختی، ژمارەیەکیشیان لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی مانەوە،" دەوڵەتی یەهوودا " یان پێک هێنا کە پێتەختەکەی شاری ئورشەلیم بوو. بەم جۆرە وڵاتی داوود کرا بە دوو بەشەوە، کە هەمیشەش پێکەوە لە شەڕ و کێشەدا بوون .

ئاشوورییەکان هەر دوو دەوڵەتیان هێنایە ژێر ئاوەنگی خۆیانەوە لە پاشانیش کەلدانییەکان بە سەر ئاشوورییەکاندا زاڵ بوون و بەهۆی لاواز بوونی ئاشوورییەکانەوە،دەوڵەتی میسر هەلی بۆ هەڵکەوت و دەوڵەتی یەهوودای گرت .

لە ٥٩٧ ی " پ . ز "دا "بختالنصر" کەلدانی پەلاماری بردە سەر فەلەستین و قودسی گرت و سەدەقیای لە جێگای خۆی دانا . بەڵام سەدەقیا لێیهەڵگەڕاوە و ئەویش لە ٥٨٦ دا ئەو شارەی گرتە ـ وە و دوای کوشتارێکی زۆر شارەکە و هەیکەلی سولەیمانی لێ رووخاندن، دوای زاڵ بوونی کووروش بە سەر بابلدا فەلەستینییەکانیش سەریان بۆ کووروش دانەواند .

ئەسکەندەری مەقدوونی ئێرانییەکانی تێک شکاند و سووریای گرت و بەوجورە فەلەستین کەوتە ژێر دەسەڵاتی یۆنانەوە

دوای مردنی ئەسکەندەر یۆنان دابەش کرا و فەلەستین کە وەبەر "ئەنتیغووس کەوتبوو لەپاش شەڕی غەززە کە ساڵی ٣١٢ ی "پ . ز" رووی دا ، بوو بە بەشێک لە خاکی میسر . ئەمما لە ١٩٨ ی " پ . ز " دا جارێکی تر حاکمی یۆنانی سووریا دەستی بەسەر فەلەستیندا گرتەوە

فەلەستین لە پەلاماری رۆمییەکانیش بێ بەش نەبووە و پۆمپی سەرداری رۆم بۆ یەکەم جار لەپاش سێ مانگ ئابلۆقەدان شاری قودسی گرت . لە سەردەمی " یوولیۆس " قەیسەری رۆمدا حکوومەتی ئەم مەڵبەندە درا بە " ئەنیتیپاس ئەدوومی "و سەرەڕای چەندین جار راپەڕینی جوولەکەکان فەلەستین هەر لەژێر دەسەڵاتی رۆمییەکاندا مایەوە. دوای دابەش بوونی ئیمپەراتۆری رۆم بە دوو بەشی غەربی و شەرقی فەلەستین بوو بە بەشێک لە ئیمپەراتۆری رۆمی شەرقی کە پێتەختەکەی شاری " بزنتە " بوو. لە شەڕی نێوان ئێران و رۆمی شەرقیدا کە ساڵی ٦١٤ ی (ز) رووی دا و بە سەرکەوتنی ئێرانییەکان کۆتایی پێ هات فەلەستین جارێکی تر کەوتەوە دەستپادشایانی ئێران .

(١) ئەو سامەڕایە ئێستا ناوی " سبووتیە " یە و لە ١٠ کیلۆمیتری شاری نابلۆسدایە.

## ئامۆژگاری صلاح الدین بۆ مەلیک زاهیری کوڕی: تەوسیەی ئەوی خوا ئەمری پێ‌کردوە، منیش ئەمرت

لە پاش هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام حەزرەتی محمد ( د.خ) لەشکرێکی بە سەرکردایەتی حەزرەتی ئەبووبەکر ( ر.خ) بەرەو شیمال سوریا و فەلەستین و....." نارد کە لەبەر کۆچی دوایی حەزرەت‌چوونی ئەو لەشکرە وەپاش‌کەوت .لە ساڵی ٦٣٣ ی (ز) دا حەزرەتی ئەبووبەکر ( ر.خ) چەندین لەشکری بەرەو شیمال نارد و "هیرقیل" ئیمپەراتۆری رۆمیش بۆ بەرەنگار بوونیان سپایەکی گەورەی بەسەرکردایەتی " تیۆدورۆس " ی برای ناردە مەیدانەوە کە لە ساڵی ٦٣٤ ی (ز) دا سپای ئیسلام بە سەرکردایەتی خالیدی بنی وەلید تێکی شکاند و فەلەستین بوو بە بەشێک لە وڵاتانی گەورەی ئیسلامی .

خەڵکی شاری قودس لە پێشدا لە بەرانبەر سپای ئیسلامدا خۆیان بە دەستەوە نەدا ، بەڵام سەرەنجام هەیئەتێکیان ناردە لای حەزرەتی عومەر ( ر.خ) و پێشنیاری ئاشتی‌یان هێنایە گۆڕێ ، بە مەرجێک خەڵیفە بۆ خۆی بە سەر شاری قودسدا رابگا . پەیمانێکی ئاشتیش مۆر کرا .

لە سەردەمی بەنی ئومەییەدا فەلەستین تابیعی دیمەشق بوو ، لەسەردەمی بەنی عەبباسدا بوو بە بەشێک لە حکوومەتی عێراق و لە سەردەمی " توولونی" یەکانی میسردا خرایە سەر خاکی میسر. کاتیک " ئەخشیدی‌یە " و دوای ئەوان " فاتمی"یەکان بە سەر میسردا حکوومەتیان دەکرد ،فەلەستین هەر بە بەشێک لە میسر دەژمێردرا .

دوای ئەوەی سەلجووقی‌یەکان بە سەر ئاسیای پچووکدا زاڵ بوون، لەشکریان بردە سەر فەلەستین و قودس و رەملەیان گرت . بەڵام لە ساڵی ١٠٧١ دا لە بەر پەلاماری فاتمی‌یەکان خۆیان رانەگرت و پاشەکشەیان کرد . دوژمنایەتی نێوان سەلجووقی‌یەکان و فاتمی‌یەکان هەر بەردەوام بوو بەڵام قودس لە دەست فاتمی‌یەکاندا مابۆوە و لە ئاکامی لاواز بوونی ئەواندا بوو کە خاچ پەرستانی ئورووپا توانی‌یان بە سەر فەلەستیندا زاڵ بن .

لێرەدا دێینە سەر باسی ژیان و خەزاکانی صلاح‌الدینی ئەییووبی کە شەڕی خاچ پەرستانیشی تێدا دەخەینە بەر باس .

**بنەماڵەی صلاح الدین :**

باپیری صلاح‌الدین شادی کوڕی مەروان بوو ، کە لە شاری دوێن(٢) لە مەڵبەندی ئازەربایجاندا دەژیا . پاش ئەوەی مجاهدالدین بیهرووز لە لایەن سوڵتان مەسعوودی سەلجووقی‌یەوە دەسەڵاتی بەغدای بەدەستەوەگرت ، شادی لەگەڵ دوو کوڕی خۆی نجم‌الدین ئەییووب اسدالدین شێرکۆ روویان کردە بەغدا و لە لایەن بیهرووزەوە پاراستنی قەڵای " تەکریت "ی پێ ئەسپێردرا .

پاش چەند ساڵێک شادی ئەمری خوای بەجێ هێنا و نجم‌الدین ئەییووبی کوڕی لە جێگای دانیشت . لە ماوەی دەسەڵاتداری نجم‌الدین ئەییووب لە تکریتدا بەو جورەی لە شەرەفنامەدا هاتوە ، اسدالدین شێرکۆی برای لەسەر دیفاع لە ناموسی ژنێک دۆستێکی زۆر نزیکی نایبی سوڵتان مەسعوودی سەلجووقی لە بەغدا دەکوژێ . نایبی سوڵتان مەسعوود لە نامەیەکدا بۆ " نجم الدین ئەییووب " دەنووسێ :

**ئەو کابرایەی کە برای تۆ**

لە ساڵی ( ٦٣٣ ،ی .ز )دا حەزرەتی ئەبووبەکر " ر.خ " چەندین لەشکری بەرە و شیمال نارد و " هیرقیل " ئیمپەراتۆری رۆمیش بۆ بەرنگار بوونیان سپایەکی گەورەی بە سەرکردایەتی(تیۆدورۆس) ی برای ناردە مەیدانەوە کە لە ساڵی ( ٦٣٤،ی . ز )دا، سپای ئیسلام بە سەر کردایەتی خالیدی بنی وەلید تێکی شکاندن و فەلەستین بوو بە بەشێک لە وڵاتی گەورەی ئیسلامی .

(٢) مێژوونووسان لەسەر ئەو ناوە کێشەیانە هێندێک دەڵێن : لە نێوان هەولێر و رەواندزە و نیزیکی گوندی دێرحەریرە کە سەروەختێک پاتەختی فەرمانڕەوایی سۆران بووە . زانای گەورەی کورد مەلا محمد کوڕی حاجی‌هەزار مێردی لە ابن خەلەکانی کوردەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویە : " دوێن دال بۆر و واوزێر . شارۆکێکە لە نزیک هەولێر و زۆربەی کاول کەیە و ئەمڕۆ ئەو دەوروبەرە بە وڵاتی سۆران ناسراوە " .

هێندێکیش گوتوویانە : لە ئازەربایجانەو کەوتۆتە لای سنووری(ئاران ، یەرڤان ، گورجستان ) شەرەفخان خۆی‌لای وایە و گەلێک لە مێژووناسانی

←

رەخیزە : وەکوو گوێنی وایە و جلی پان و درێژ عەرزی دەگرێ و شین دەبێ .

تیسمۆرگە : گیایەکی چکۆلەیە وەک ئەڵەکۆکی و ئەسپینگی دەچێ بەڵام تیسمۆرگە شینترە وەک بیزایە دەخورێ.

خۆش هەڵکێش : گیایەکە لە نێو گەنمان شین دەبێ .

سەپان ترێنە : بابردەڵەشی پێ دەڵێن .

شەش پەڕ : گیایەکە گەڵای پان و درێژ ئەغڵەب لە سەر قەبران شینی دەکەنەوە .

کاشمەر : گیایەکە وەکوو کاهوی .

هەڵز : گیایەکی کورتە باڵای گەڵاخڕە لە کوێستانان دەبێ بنەکەی رۆنی لێ دەگرن بۆ زیددی عوفوونی برینان دەبێ ، کرمی دەکوژێ .

بۆڕ : گیایەکی گەڵا باریکی قاسک ئەستوورە وەکوو گوێنی لە سەرەوە پان دەبێتەوە لۆ "و" لۆکەن"یشی پێ دەڵێن .

هەڵاڵە : گیایەکی گەڵا وردی بۆن خۆشە گوڵێکی وردی زەرد دەکا زیاتر لە کوێستانان شین دەبێ .

سێوەڕە : گیایەکە وەکوو وێنجەی دەچێ ماڵات چاکی دەخوا ، گیایەکی ناسک و شین و جوان و گەڵا وردە .

گوڵە شللێرە — نێرگس

شللێر : گیایەکە زیاتر لە کوێستانان شین دەبێ وا هەیە میترێک بڵند دەبێ دووەمەرتەبە و سێ مەرتەبە لە قەدی و لە تەپڵێ سەری دەدا گوڵەکەی وەکوو زەنگۆڵەی پێیدا شۆڕ دەبێتەوە .

مێکوک : گیایەکی گەڵا وردی بەدەوامە لە زۆر جێیان شین دەبێ نیو میتر بڵند دەبێتەوە بنی وەکوو شەکری شیرینە ، بنی دەرمانە .

کەکرە : گیایە کەکرەش هەر وەکوو مێکوکی دەچێ بەڵام گەڵای مێکوکی شینترە .گەڵای زۆر تاڵە.

گوڵێ رێواس : گوڵێکی سوور سووری وردە هەر شیرنە تەماشای کەی تەگەر دەکا و گوڵێ دەکا و وشک ەەبێ . لەسەر تاقەی دەگوڵدانیدا داینێی دوو مانگان زیاتر گوڵەکەی ناوەرێ .

چاترە : گیایەکی گەڵا چکۆلەیەوخڕ. بۆنێکی خۆشی هەیە وەک گوێنی پنجی دەکا عارەقی لە گیایەکەی دەگرن بۆ زگ ئێشەی چاکە .

بێزان : گیایەکی بۆن خۆشە گەڵاکەی هەر وە گێزەری دەچێ هەزار عەتری (شبهای پاریس )ی بە قوربان بێ .

وەنەوشە : گیایەکی گوڵ وردە وەک سێوەڕەی گوڵێکی تێکەڵ دەگەڵ زەرد و سپی دەدا گوڵێ چکۆلە و وردە زیاتر لە دەم جۆگان و لە جێی ز نەدار شین دەبێ .

سوێسن : گیایەکە دوو سێ گەڵای بە قەت قامکی هەیە گوڵێکی وەک قووچەکەی وەک زەنگۆڵەی لە سەری دێتە دەر کەم عومرە بەهاران شین دەبێ لە بن نوالە بەفران دێتەدەر .

سوورە پنگ : لە بن جۆگە و چێنگ و شیغالان شین دەبێ لە شینە پنگی گەڵای پانترە تەبعی رەوانە هەر کەس بیخوا زگ چوونی پێدەگرێ .

چەپچەپی گیایەکە لە مێرگان شین دەبێ قاسکی کلۆرە لە تەپڵێ سەری و لەنتی و قەدیدا گوڵێکی زەرد زەرد دەدا هەر جوانە تەماشای بکەی .

قاللۆر : گیایەکی قاسک ئەستووری نێو کلۆرە بە قەد بەژنی ئینسانی بڵند دەبێ .

گڕالک : گیایەکە گەڵا باریک وەکوو گەڵای سەر پنجی. وەک گوێنی پنجی دەدا ماڵات نایخوا بە بەندەنان وشک دەبێ زستانی دەمێنێتەوە .

لووشە : گیایەکی شین شینە گەڵای پانە وەکوو گەڵای گون گونە سەگانەی بەڵام لووشە دەخورێ دۆڵمەی لێ دروست دەکەن .

گوڵە رۆنە : گیایەکە گوڵێکی زەردی خڕ دەدا بۆنی وەکوو بۆنی بێزانێ وایە هەزار عەتری گوڵێ کاشان و عەتری " شبهای پاریس "ی بە قوربان بێ .

لاولاوە : گیایەکە قاسکی باریکە ۴ تا ۵ میتر بڵند دەبێ گوڵێکی وەکوو گوڵێ ئەتلەسی دەدا سوور و شین و کەسک و آبی هەمە رەنگە .

کوڕادە : گیایەکە لە کوێستانان دەبێ هەر وەک پیوازی تەڕ دەچێ و هەروەها وە سیری وەحشی دەچێ ودەخورێ

گوڵە مێلاق : هەمان گوڵێ لالەیە کە گوڵێکی سووری وەکوو فنجانی دەدا گەڵاکانی پان و درێژۆکەیە .

وشترە خۆرە : گیایەکە دڕاوی و شین وشتر چاکی دەخوا .

هێرۆ : گیایەکە بڵند دەبێ قاسکی ئەستوورە گوڵێکی ناسکی گەورە دەدا .

ترشه خاتوون : ترشۆكەی پێدەڵێن لە جێگای خیزك لە بن ڕەوەزی شاخان شین دەبێ وەك گراڵكی بە شلكی ترش ترشە ئینسان دەیخوا بۆ كەبەدی باشەرەوانیشە

نەعنە كێوی : گیایەكە زیاتر لە شاخان لە نێو بەردان لە جێی سەخت شین دەبێ گەڵای وەك دەنكە شەمچەی وایە بۆنی زۆر خۆشە لە نەعنەی دەستچین بۆنی خۆشترە .

گەسگەسك : گیایەكی قاسك كلۆری شینی دڕاوی بڵندە بە ناسكی دە دۆكلێوی دەكەن ئەگەر دەستی لێدەن دەستی پیاوی دەخورێنێ دڕوەكەی وادیارە مادەیەكی شیمیایی پێوەیە ئەگەر بەڕرەسی عیلمی بكرێ ئەوا حەتمەن روون دەبێتەوە .

كاردوو : گیایەكی گەڵا پانە وەكوو گەڵای ترشە گایەی بەقەد لەپی دەستی پانە تامی وەك بیباری تیژە لە ئالانێ تێكەل برنجی دەكەن و پێی دەڵێن كاردوو پلاو .

گەسكە سپیلكە : وەكوو گیا ترشۆكەی بڵند دەبێ شووی پتەوە گەڵای باریك و وردە بەدەوامە دەیكەنە گەسك بۆنی وەكوو بۆنی بێژانێ خۆشە لە ماڵاندا دایدەنین بۆ بۆن خۆشی .

گوڵە گورگە

گوڵە گورگە : گیایەكی بێگەڵایە قاسكێكی ناسك و تەڕی هەیە لە تەپڵێ سەری گوڵێكی زۆر سوور سوورێكی توند دەر دەكا وەك مەخمەری سوور زۆر جوانە بەڵام كەم عومرە ، زۆر زۆر عومری حەفتەیەكە

پێمجیلكە : گیایەكە وەكووگێلاخەی چكۆلە ، لە عەرزی دڕوێ سێ قۆزاخەیە وەك قامكی مریشكی .

گوڵە جووتیار : گوڵێكە وەك گەزیزەی دەچێ بەڵام گوڵەكەی لە گوڵی گەزیزەی برێك پانتر و ناسكترە .

شەمێلە : گیایەكی دەستچێنە وەكوو پۆلكە و گەنەمە ئەوانە دەیدەن بە ماڵاتی ،ماڵاتی پێ قەڵەو دەبێ.

قازیاخە : گیایەكی شینی پەڕپەڕە گیایەكە كە دەخورێ دە دوكلێوی دەكەن .

ئالەكۆك : گیایەكە هەر وەك ئەسپینگی كەسێكی گیا ناس نەبێ وە دەزانی ئەسپینگە ئەگەر بیخوا زگجوونی پێدەگرێ بۆ مەعدەی ڕەوانە ئەگەر كەسێكی زگی بە هیچ كاری نەكا ئالەكۆكی بخوا پاك دەبێتەوە .

گیا ڕەكێشە : گیایەكە لە باغجان لە باغان لە شاخان شین دەبێ گەڵای وەكوو گەڵای گوڵە پێغەمبەرەیە كورتترە لە برینی دەنێن هەوای برینەكەی دەكێشێ

سوراڵك : گیایەكە بە قەد كیفاری گەڵای وەك گەڵای گەسگەسكی پەڕە پەڕەیە زۆر شینە،مەیل بە سوورییە. بەنی پێ سوور دەكەن دە ئاویدا لە گەڵ بەنی دەیكوڵێنن بەنەكەی سوور دەكا .

كیفۆك : گیایەكە سێ پەلكەی باریك دەردەكا خەتێكی سپی بە نێوەراستی پەلكەكانیدا هاتوە بنی خڕە بەقەت كەلێیە قەندێكی دەیكوڵێنن ، دەخورێ .

بربرە : گیایەكی شینە زۆر ناسك و لەتیفە لەبێستاناندا لە باغان ، لە شاخی دەبێ بۆ زگ ئێشەی باشە وەكوو جلێ نۆكی دەچێ بەڵام گەڵاكانی فەرقی هەیە .

ماكووز : گیایەكە هەر وەكوو كووزەڵەی دەچێ لە نێو ئاو و زەند و كانیاواندا شین دەبێ .

تالشك : گیایەكە گەڵا پان بەقەد گەڵای كاهووی زیاتر ، كەو دەیخوا ، ماڵاتیش دەیخوا .

تێسوە گایە : هەر وەكوو تێسوە بزنەی وایە بەڵام قەفی ئەستوورترە گەڵاشی پانترە بە شلكی پاكی دەكەن وەك ڕێواسی دەیخۆن .

كووزەڵە : گیایەكە ریشەی بە ئاوی دەگورێ لە نێو كانیاوان شین دەبێ دەڵێن تەڕەتیزەی وەحشی یە دەخورێ .

كارگی كەمایە : بەو كارگە دەڵێن كە لە بن كەمایە هەڵتۆقی و بێتە دەر .

گیا كەوڵە : گیایەكی باریك و نەرمە لە پێش هەموو گیایاندا شین دەبێ و لە پێش هەموو گیایانیشدا زەرد دەبێ .

مارێواس : وەك ڕێواسی بن بەردی وایە پانە و ترش و ئاودارە ڕێواس پێنج جۆرە . باسكلاو ، نێرتكەرێواسە ڕێواسی بن بەردی، لەق لەقە ، مارێواسە .

شاتەڕە : هەر وەك گیا ڕەكێشەی وایە .

توڕاسك : گیایەكە بەری دەدا وەك قۆرەی لە دەور و بەری دێیان دەبێ .

مژمژۆكە : گیایەكی شینە پنجی دەكا گوڵێكی ئابی توند دەدا ئەگەر دەیمژی تامی شیرنی هەیە دەڵێن چای ئەو گوڵەی بۆ قەلبی باشە

سێوەڵووكە : گیایەكە كورتە بالا.میوەیەكی هەیە وەكوو سێوە ترشەی خوڕ خوڕە .

تێسوێ : تێسوێ گیایەکە نێرتکەی بلّند دەبێ نیو میتر ، ئەگەر پاکی کەی وەکوو نێرتکی کاهووی دەخورێ تامی کاهووی دەدا .

نۆکە شوانە : گیایەکە هەر وەک نۆکی دەستچین بەلّام وەحشی یە دەنکەکانیشی دەنێو پێستێکی وەکوو باقلەی دایە .

چەقەش : گیایەکە وەکوو گیا کوڵکنەی ، بنی دەبڕی شیرێکی لێ دێتە دەرێ چەقەی پێ خۆش دەکەن و بە شاوی دەیخۆن .

ئەسپۆن : گیایەکە لە کوێستانی عەزیم دەبێ بە عەرزی و بنجی دەبەستێ وەکوو بەقجیلەی ولّاتی دادەگری بنەکەی هەڵدەقەنن کەفێ دەکا لیباسی پێ دەشۆن .

گیا بەرانە : گیایەکە شووڵکی دێتەوە بلّند دەبێ میترێک دەیکەنە چێغ وەک زرەبیزای وایە .

گیا هەوێدار : گیایەکە گەڵای زۆر پانە لە نێو بانان لە نیسێیان شین دەبێ . لە سەر برینی جێ دەمی ماری دادەنێن .

کەرتەوڵ : گیایەکی قاسک ئەستووری کلۆرە بە قەد بەژنی ئینسان بلّند دەبێ .

کەر تەشی : هەر وەک کەرتەوڵی گیایەکی کلۆرەی قاسک ئەستووری بلّندە لە گۆکەمی بلّندترە .

کێلاخە : گیایەکی شینی گەڵا پانە بە قەد قامکی.دەگەڵ دۆکلّیوی دەکەن دەخورێ .

هۆزەلّاو : گیایەکە لە نێو کانیاوان شین دەبێ وەکوو کووزەڵە و کووز و ماکووزان دەچێ .

دۆقلّێشە : گیایەکی وەکوو ئەسپینگی بەلّام بنی هەیە بنەکەی بۆن و تامی هێلی هەیە بزن ئەگەر لەشاخی تووشی بێ بە سمی دەیداتەوە هەتا بنی دەر- نەهێنێ ناڕوا .

زیزەرەمەندە : گیایەکە نێرتکی دەکا نێرتکەکەی پاک دەکەن دەیخۆن بۆنی لە عەتری خۆشترە زرەمەندۆ - کیشی پێ دەلّێن .

سەهلاب : گیایەکە بستێک هەڵدەستێ گوڵێکی سووری پڕ دەدا زۆر جوانە لە نێو مێرگان دەبێ بنی هەیە بنەکەی خڕە . دەری دێنن بۆ بەستەنی بۆ کۆجەی تاجران دەیکڕن . گیا سالەمشی پێ دەلّێن.

کەلەم کاشوور : گیایەکە وەک گیا قازیاخەی ئەویش هەر بە گیا دۆکلّیو مەشهوورە دە دۆکلّیوی دەکەن .

بیزا : گیایەکی شینی گەڵا باریکە وەکوو بۆڕی دەچێ بەلّام ئەو قاسکی باریکترە بۆنخۆشە دەخورێ دەگەڵ شیرێژی دەکەن و زستانانیش نێرتکەکەی دەسرکەی دەکەن لە کوێستانان دوور بۆنی دێ .

چرێش : گیایەکە شەش حەوت گەڵای بە قەد قامکی پان دەر دەکا بستێک بلّند دەبێ چرێشی لێ دروستدەکەن

گیاچا : گیایدکە وەک گیا کوڵکنەی گەڵایەکی پانی چکۆلە ، بۆ خۆشی برکەی چکۆلەیە گەڵاگەی وشک دەکەن ئەگەر گەیشت چای پێ لێدەنێن تامی زۆر خۆشە .

قوون سوور : گیایەکی شینە دوو پەلکە ، گوڵێکی خڕی لە نێوەراستی پەلکەکاندایە ، دەخورێ بۆ دۆکلّیوی دەبێ

گەنەمە : گیایەکی دەست چینە وەکوو پۆلکەی دەیدەن بە مالّاتی ، مالّاتی پێ قەڵەو دەبێ .

نووسەکە : گیایەکە وەکوو چلّی نۆکی گوڵەکانی دەبنە دڕووی خڕخڕ ئەگەر بە نێویدا بڕۆی بە لاق و لەتەری ئینسانا دەنووسێ .

کەکرە : گیایەکە وەک مێکوکی وەک هووڕەی وایە بەلّام گەڵاکەی لە گەڵای مێکوکی باریکترە زۆر تالّە شاوەکەی دەگرن ئەگەر ددانی خوراو بێشی تۆزێکی لەسەر دادەنێن چاکی دەکا و ژانی دەشکێنێ .

ئەسرێلک : هەمان چرێشە لەولّاتی دیوی نەلّێنێ پێی دەلّێن ئەسرێلک .

زەنبەق : گیایەکە یەک شیشە هەڵدەچێ وەک داری خورمای گەڵاکانی ئەوبەر ئەمبەر لێ دەڕوێ گوڵێکی دەدا وەکوو گوڵە جووتیار و گەزیزە و گوڵە پایزەی بڕێک زەلامترە .

گەنەمە : گیایەکە بایدەدەن وەکوو گوریس قایمە ناپسێ .

---

# مزگێنی

ئینتیشاراتی صلاح الدینی ئەییووبی (ناوەندی بلّاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی) کە بۆ ژیاندنەوە و بووژاندنەوەی زمان و ئەدەب و فەرهەنگی کوردی پێک هاتوە . تا ئێستا ئەم پێنج کتێبەی ناردۆتە ژێر چاپ و خوا یار بێ ، بەم زوانە دەکەونە دەستی خوێنەرە خۆشەویستەکان .

١ ـ دیوانی نالی ، بەشەرحی ماموستا عبدالکریمی مدرس و کوڕەکانیەوە .

٢ ـ دیوانی وەفایی ، لە ئامادە کردنی ، ماموستا محمد عەلی قەرەداخی .

٣ ـ کرد در تاریخ همسایگان،ترجمهٔ مهندس فاروق کیخسروی.

۴ ـ کۆیلەی راپەڕیو ، وەرگێڕانی ماموستا بەهرەوەر .

٥ ـ شاری وێران ، نووسینی کاک عەلی حەسەنیانی .

ئەم ناوەندە ئامادەیی خۆی دەر دەبڕێ بۆ چاپکردنی شوێنەوارە چاپ نەکراوەکانی شاعیرانی کۆن و باشمان و دیوانی شاعیرەکانی هاوچەرخ و نووسینی نووسراوی نووسەرە بەرز و خۆشەویستەکانی کورد بە فارسی و بەکوردی ، بەو مەرجە دەستەی نووسەرانی گۆوارەکەمان پەسندیان بکا .

ئینتیشاراتی صلاح الدینی ئەییووبی

# ئاڵەکۆک

کەریمی قەیسوومی

بەهارە حاکمی تێک شکاوی قەڵا ڕماوی بەفر ، لە دوورەوە چاوی بڕیوەتە تەرمی سوپای .سوپای بەفر تین وتەوژمی رابردوویان لە دەست دابوو، هەر یەک لە سووچێکەوە لە پەنای سێبەری رەوەزە بەردێک خۆیان حەشار دابوو . بەفر ئەو دیمەنانە بە چاو دەبینێ.تکە فرمێسکەکان لە چاویدا قەتیس دەمێننەوە پاش تاوێک چۆڕچۆڕ بە داوێنیدا دێنە خوارێ و مزگێنی بووژانەوەی. گوڵان بە پێدەشتە خەملیوەکان دەدەن . هەر وا کە بەرەو بەرزایی هەڵدەکشێ دەسەڵاتداری خۆی دێتەوە بیر . گەرچی زۆر منداڵی پاپەتی لە ترسی دیتنی ئەو لە سووچی هەرزاڵی هەڵ لەرزیون ، زۆر هەتیوی لەباوەشی دایکی چارە ڕەشدا وشک هەڵێناوە . دار و دەوەنی بەزۆر جلکی سپی پێدا دابوو . حاکمێک بوو کە بۆنی هەناسەی تاسەی بووژانەوەی هەر چی گوڵ بوو هەتا هەتایە دەمراند ، بەڵام‌تەنیا بیرەوەری یەک لە هەموان پترجار نا جارێک دەهاتەوە بیری . ئەو دەم کە بە سەر زاڵەکانی وەک زاڵدا زاڵ بوو رۆژێک بۆ پیاسە پێ دەنێتە سەر زەوی، دەگاتە سەر دەراوی کانی یەک . سەری سووڕدەمێنێ !!

چۆن دەبێ رەشەبا و زریان ئەرکی خۆیان بەجێ نەهێنابێ ؟ روو دەکاتە کانی یەکە و دەڵێ : کانی بە ئیزنی کێ زیندووی ؟ ئەو ئاوە جوانە چیە ؟ کانی بە ترسەوە دەڵێ : گەورەم لە ئەمری تۆلانادەم و سەر بانادەم. ئەو ئاوە بەرهەمی دڵسووتان و گریانی منە. بەفر دەڵێ : بۆ دەگری ؟ کانی دەڵێ: ماوەیەک کیژۆڵەیەک دەگری و گریانیئەو ئاگری لە من بەرداوە . بەفر کە جوان دەڕوانێتە دەور و بەری ، ئاڵەکۆک دەبینێ .... لە ناو ئەو بیرانەدا نوقم ببوو کە سۆزەی شەماڵ لە دوور ڕا دی . لە ترسان بۆ ماوەیەکی دی خۆ حەشار دەدا ، بەڵام شەماڵ بە دەست و برد هاڵاوی دەکاتە سەر و لایەکی دیکە لە سوپای بەفر رەش دەکاتەوە .... شەماڵ دەڕوا هەتا هەرێمی ژێر دەسەڵاتی خۆی بە سەر کاتەوە . بەفر دەکەوێتەوەبیری ئاڵەکۆک . پاش دیتنی ئەو دیمەنە دەگەڕێتەوە بەرزایی بەڵام ئۆقرەی ناگرێ و بە پڕتاو دێتەوە لای . دەبینێ لە جاران کزتر و سیستر و ژاکاوترە. پێی دەڵێ : ئەی ئاڵەکۆک بۆ وادا ماوی؟ ئاڵەکۆک دەڵێ : هەر کە تۆ دەبینم دەردم لێ گران دەبێ . بەفر بەو هەموو تاوو تین و گوڕەوە شەرمێ دەکا زۆر جاری وا هەیە ئادەمیزاد لەو پەڕی دەسەڵات و توانادا شەرمێ دەکا . بە هەر جۆرێک دەبێ زاری هەڵدەبڕێ و دەڵێ : ئاڵەکۆک ، ئاڵەکۆکی نەشمیلانە تۆم لە بەرزایی چیا و لە داوێنی لووتکەیبەرز و لە دەم کانیاودا دیوە کە چەند جوانی لە ژیانمدا هەر چی بەکم ویستوە پێی گەیشتووم ، ئیزنم دەدەی قسەیەک بکەم ؟ ئاڵەکۆک کە لە سەرمان هەڵدەلەرزی بە ترسەوە کوتی : فەرموو! بەفر کوتی : خۆشم دەوێی ئاڵەکۆکی شەرمێون، لەشی گەرم داهات و لە شەرمان عارەقەی ساردی بە لاجانگیدا هاتنە خوارێ و کوتی : ئەی بەفر من کاکم لە سەفەرێیە ئەگەر ئەو هاتەوە بنێرە خوازبێنیم . خوشکان لە قسەی برایان دەرناچن. بەفر کوتی : هەر ئێستا دەچم دەستوور دەدەم بیهێننەوە لات . ئاڵەکۆک دەڵێ : باشە بەڵام دەردی من هەر ئەوە نیە ، کاکم ناتوانێ بگەڕێتەوە . بەفر دەڵێ: رادەوەستم چاوەڕێ دەبم بەو شەرتەی بەڵێنیم پێ بدەی . ئاڵەکۆک دەڵێ : پاش کاکی گەورەم ، کاکی چکۆلەم دەچێتە سەفر . بەفر دەڵێ : رادەوەستم با هەر دووکیان بگەڕێنەوە ، دوایە مێردم

پێ دەکەی ؟ ئاڵەکۆک دەڵێ : راوەستە دوای ئەوانە ئەمنیش ببووژێمەوە. شەماڵ بسکەکانم بداتەوە لە بەر شەبەقی کانیاوی لاپاڵ بە شانەی کەم . ئەو دەم بۆ خۆم لێت رادەسپێرم . بەفر دەڕواتەوە و ئەو ژوان و دوان و جێژوانەی لە بیر ناچێتەوە . ئێستا خۆی وەبیر دێنەوە ، ئەویندارێکە کە دەزگیرانەکەی بە بەر چاویدا بە لەنجە و لارێتێدەپەڕێ بەلام برستی دەربڕینی خۆشم دەوێی لە ناو گەروو و زاریدا پەنگی خواردۆتەوە ... دەزانێ کە ئاڵەکۆک شوانە وێڵەی خۆشدەوێ ، سەرە ڕای ئەوەش بەفر خۆشی دەویست . دیسان بیر وخەیاڵ هەڵیانگرتەوە و بەرەو هەرێمی دوور دەستی خەیاڵی ئەوینی ناکامی برد خوازبێنی وەبیر هاتەوە چلەی گەورەو چکۆلە کەڕا بوونەوە . زریان لە ماڵی ئاڵەکۆک سەری قسانی شکاند و گوتی: ئێمە لە لایەن کەسێکەوە هاتووین بۆ خوازبێنی کە حەوت جۆشی لە تەندوور دا شەق دەکا . ژن و مێردان لە پاڵ یەکدا رەق هەڵدێنێ گیان لەبەر وبێگیان وشک هەڵدێنێ و تەواوی دنیا لە چوارچێوەی سەهۆڵ دەکرێ . چلە وەڵامی دانەوە پاش راوێژ لە گەڵ ئاڵەکۆک هەوالێتان پێ دەدەمەوە ....

ئەوا بەهارە و خاکەلێوەیە ئەزریان دیارە و نە شنەبا ، نە پرووشە دیارە و نە رەشەبا ، بەفر هەروا چاوەڕوانە راسپاردەیەک بێ و مزگێنی بۆ بێنێ . هەروا لە داوێنی ئەشکەوتێک پاڵی داوەتەوە و چەند سەربازی چلوورە پاسەبانی ئەون . بەفر کە چاوی هەڵدێنێ دیمەنێک دەبینێ کە دەردی لێ گران دەکا . دەبینێ چلوورە دەگری گوێ هەڵدەخا زریان ئەوا دێ ....بەفر لە جێگای خۆی هەڵدەستێ و تۆزی لە سەر شان نیشتووی دەتەکێنێ و چلوورە ژێر دەبێتەوە . زریان دەورێک لێدەدا . ئەشکەوتەکە لە باوەشدەگرێ و دوایە بەرامبەری بەفر چۆک دادەدا و دەڵێ ؛ قوربان ئاڵەکۆک لە کوێستانی چاوەڕوانە . دەڵێ بێ و بمخوازێ . بەفر بارگەی تێک دەنێ و بەرەو کوێستان وەرێ دەکەوێ . سەفەرەکەی مانگێک دەخایەنێ . کە دەگاتێ لە دەروای کانی یەک ئاڵەکۆک راوەستاوە و دەم و چاوی دەشوا و هاوڕێی شنەبای فێنکی بەیانی سەمایە دەکا و بە جوانی خۆی دەنازێ . هەر کە بەفری دەبینێ بە شەرمەوە هێندێک سەری هەڵدێنێ و دەڵێ: بەفر ئەوا هاتی ؟ ماوەیەکە چاوەڕوانم .... هەر ئەوەندەی دەڵێ و دەستدەکا بە گریانێ . بەفر دەرد و کەسەر و پەژارەی خۆی لە بیر دەچێتەوە و دەڵێ: گیانەکەم چت بەسەر هاتووە ؟ ئاڵەکۆک کە سەری بە هەنیسکانەوە هەڵدەکەندرا نەیتوانی هیچ بڵێ . بەفر دیسان دووپاتی کردەوە ، ئەو جار ئاڵەکۆک ئاڵەکۆکی شەرمێون کوتی : شینی خوشکان بۆ برایان حەلالە ، هەردووک برام مردن. ئەو جار تەنیا و تەنیا لە دەم ئەو کانیاوە ماومەوە . بەفر ئەو جار زەماوەندت لەگەڵ دەکەم . بەلام بەفر بە دەنگێکی لەرزۆکەوە دەڵێ :

**ئاڵەکۆکی پرچنە**
**جۆرجۆرەم کەوتە بنە**
**چ بکەم لەو ماڵ و ژنە**

ئەوەندەی دەڵێ و دەچێتە ناو گۆڕی تەنگ و تاریکی زەوی یەوە . ئاڵەکۆک هەروا چاوەڕوانە . ئەوە بەهارە و بەهاری نوێ و شینی بەفری دەگاتە گوێ.

**... پاشماوەی سەرداری ...**

بۆ جاری سێهەم لە ساڵی ٥٦٤ ی. ک " ١١٦٩ ی. ز" دا صلاح الدین بەپێچەوانەی ویستی خۆی و لەسەر داخوازی سوڵتان نورالدین لەگەڵ شێرکۆی مامی بەرەو میسر رۆیشتن . بە هاتنی لەشکری شام حاکمی قودس ناچار بە پاشکشە بوو، خەلیفە قەدر و حورمەتێکی زۆری لە شێرکۆ و صلاح الدین گرت . بەڵام شاوری وەزیر کە ئینسانێکی ناپاک و دەغەڵ و دەنبەوەبڕ بوو هەر لە فرسەت دەگەڕا تاکوو زەبری خۆی لە شێرکۆ بوەشێنێ . سەرەنجام لەسەر خواستی عازید ، شێرکۆ شاوری کوشت و بۆ خۆی لە جێگای دانیشت . بەم جۆرە ئەو خاینە کە دەیویست وڵاتی میسر بخاتە ژێر دەسەڵاتی خاچ پەرستەکانەوە لە نێو چوو. دوای ئەم کارەساتە زۆری پێ نەچوو کە شێرکۆیش کۆچی دوایی کرد و صلاح الدینی برازای کرا بەجێ نشینی

(درێژەی هەیە)

# بەرگوتێک لەخەرمانی گۆرانی کوردی

ئەحمەدی شەریفی

باختەران مەڵبەندێکی گەورەی کورد نشینی ئێرانە کە پێوانەی پتر لە ٢٤٥٠٠ کیلۆمیتری چوار گۆشەیە و لە باکوورەوە خاکی تێکەڵ بە خاکی ئوستانی کوردستان دەبێتەوە لە باشورەوە هاوخاکە لە گەڵ لورستان و ئیلام و لە رۆژئاواوە تێکەڵ دوڵ و چیا و رووبارەکانی کوردستانی عێراق دەبێتەوە و لە رۆژهەڵاتەوە هەتا نزیک هەمەدان درێژەی هەیە زۆربەی هەرە زۆری دانیشتوانی ئەم هەرێمە بەگشتی کوردن بەڵام لە ناوچەی سونقور و کولیایی دا هێندێک تورک دەژین کە رەنگە لە لای هەمەدان و قەزوێنەوە هێنرابن چونکە لە ئاخر و ئۆخری حوکوومەتی قاجارەکان و سەردەمی حکمەڕەوی و ملهوڕی رەزاخاندا کوردێکی زۆری ئەم ناوچەیە گوێزراونەوە بۆ ناوچەی زەنگان، قەزوێن، کەرەج، تاران و دەماوەند و هەر ئێستاش هێندێک لە خێڵەکانی کوردی چگەنی، مافی، کاکاوەند، غەیاسوەند و جەلالوەند هەر لەم ناوچانە دەژین بە تایبەتی بە شێکی هەرە زۆری دانیشتوانی دێهاتی قاقازان، روودبار و بشاریاتی قەزوێن هەر لەو کوردانەن، هەروا لە دەور و بەری گێلان، مازەندەران و قومیش کوردێکی زۆر هەن کە هەر پاشماوەی دوورخراوەکانی دەورانی قاجار و رەزاخانن، جا رەنگە کاتێ ئەو کوردانەیان لە کوردستانەوە گواستۆتەوە تورکیان لە جێگایان دانابن و وێدەچێ کە تورکەکانی ناوچەی کرماشان و سنە و تەنانەت نەغەدەی موکریانیش هەر دیاری ئەو ئاڵ و گۆڕانە بن.

ناوچەی باختەران لە بابەتی زمانەوە دوو شێوەی سەرەکی تێدا باوە.

**١ – زاراوەی گۆرانی:**

ئەم شێوەیەش بە چەند شێوەی بچووکی مەڵبەندی وەک کوردی کرماشانی لەکی و هەورامی دابەش دەبێ و تەنانەت هێندێ شێوەی بچووکتریش.

**٢ – شیوەی سۆرانی:**

خەڵکی ناوچە بەگشتی بەم شێوەیە دەڵێن جافی، لە کەم شوێن بەم زاراوەیە دەدوێن و تەنیا لە ناوچەکانی رەوانسەر، جوانرۆ، قەڵای جوانرۆ و قشلاغ قسەی پێ دەکەن، یان باشتر بڵێم کە سنووری دەسەڵاتی ئەم زاراوەیە لە سنووری خێڵی کوردی سنجاوییەوە هەتا ناوچەی شمشیری پاوەوە لە قەڵخانییەوە هەتا ئەر رووباری سیروان، واتە باریکە سنووری نێوان دولای کوردستان دەگرێتەوە. جا بە پێی شێوەی دوان و ئاخاوتنی ئەم ناوچانە گۆرانییەکانیشیان تۆفیر و جیاوازیان هەیە، بەڵام بە گشتی باون و لە رووی ئاهەنگ و شێوەوە دەتوانین گۆرانییەکانی ئەم ناوچەیە بە سێ چەشن بەش کەین:

**١ – هۆرە**

هۆرە کە بە هۆرەی جافی مەشهوورە لە ناو هەموو کوردەکانی ئەم مەڵبەندەدا باوەو تەنانەت ناوچەی قەڵەمڕەوی هۆرە هەموو هەرێمی لورستان و ئیلام و خانەقین و مەندەلی و بەشێ لە کوردستانی سنەش دەگرێتەوە، بە گۆرانی بێژی ئەم شێوە گۆرانییە دەڵێن هۆرەچڕ، ئاهەنگ و سیلابەکانی هۆرە جۆرێکە کە دەتوانم بڵێم کوردێکی موکریان هەرگیز تێی ناگا مەگەر ماوەیەک لە ناویاندا مابێتەوە.

هۆره حاڵەتێکی ستایشی و پێدا هەڵگوتنی هەیە و رەنگە پاشماوەی ئاهەنگێکی کۆنی موغەکانی زەردەشت بێ کە ستابشی ئەهۆرا مەزدایان پێ دەکرد و تەنانەت دەگونجێ وشەی هۆرە کورت کراوەی ئەهۆرا بێ!.

**٢ – مۆر، یان سەر و مۆر**

سەر و مۆر تایبەتی لاواندنەوە و شین گێڕانە، رەنگە لە کاتی خۆیدا ژنانی کوردی ئەم هەرێمە شینیان پێ گێڕا بێ.

مۆریش لەرووی ئاهەنگەوە وەک هۆرە وایە بەڵام قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی لەهۆرە کەمترە و لە ناوچەی کوردستانی سنە و تەنانەت لە هەورامان و دەور و بەریدا مۆرەچڕم نەدیوە، بەڵام لە لوڕستان و ئیلام و تەنانەت کوردە فەیلیەکانی ئەو دیوی سنووریش مۆرە چڕیان هەیە.

**٣ – بەزم**

بەزم و گۆرانی لە ناو ئەو کوردانەی ناوچەدا باوە کە پێیان دەڵێن جاف کە شێوەی قسە کردنیان زۆر لە سۆرانی نزیکە و جیاوازی یەکی ئەوتۆی نیە، هەر وەها هەورامی یەکان و گۆرانەکان و قەڵخانی یەکانیش وشەی بەزم بۆ گۆرانی یەکانیان بە کار دێنن بەڵام قەڵخانی یەکان و خێڵی گۆران بە شیعر و گۆرانی یە ئاینی یەکانی خۆیان دەڵێن کەلام.

جگە لەم سێ چەشن و جۆرە گۆرانی یە لە ناوچەکانی جۆر بە جۆری ئەم مەڵبەندەدا هەوا و ئاهەنگی تریش هەن کە پێم وایە هەر دەگەڕێنەوە سەر ئەم سێ شێوەیە وەک ئاهەنگی کرمانجی ناوچەی کەرەند، سیاچەمانە و حاجی مەریەمی هەورامان و سەحەرەی سەحنە و بیستوون.

ئەوەی راستی بێ توێژینەوە و لێکۆڵینەوە لەسەرئەم بابەتە گرنگەی فەرهەنگ و زانستی کۆمەڵ کارێکی زۆر بایەخدارە و دەبێ زۆر بە وردی کاری لەسەر بکرێ، هیوا موایە ئەم تاقە هەنگاوە، هەنگاوگەلی تری لە دوا بێ.

با ئەوەش بڵێم کە ئەم شیعرانەی گۆرانی هێندێکیان تایبەتی ناوچەی باخترانن، بەڵام هێندێکیان لە ناوچەکانی تری کوردەواری‌یەوە بە هۆی فرستەندە رادیویی‌یە کوردی‌یەکانەوە لەم هەرێمەدا باو بوون و بە هێندیک تۆفیری شێوەوە هاتوونە سەر زاران چوون قاڵبی شێوەکانی گۆرانی ئەم مەڵبەندەوە هەر وەک هۆنراوەی گۆرانی ئێرەش نفووزی کردوە لە ناوچەکانی‌تری کوردەواریدا.

بیتی " ئ "

ئەگەر بە بێ تۆ خاو* خۆراکم بێ
حاونشە مێمان* دیدەی راسم بێ

———

ئێشن* لەم خوارە خولخولەی رۆمە
خوا خەم نەدا من خەمی تۆمە

———

ئێشن لەو خوارە گوللە بارانە
ئیجباری کوردە و لە کرماشانە

———

ئاوەکەی ئەڵوەن* چون شەتاو لێڵەن
چون هەوری بەهار لە گەشت وگێڵەن*

پیتی " ب "

باو* ئەڕای* کەرەند* جێی نەونەمامان
نە وێنەی* سەحنە* خۆشی بێ سامان

———

بۆ تۆ باری خەم نێشتگە وە لێوم
بوچ رەحمی ناکەی وە دڵەی پەشێوم؟

———

بە نووکی موژگان بیستوونم کەن
چەرخی زەمانە شیرینی لێم سەن

———

باوانت شێوی بۆ مەستی چاوت
وە کۆسەی هەجیج* نەبردم ناوت

پیتی " ب "

پراو* و بیستوون* هەر دوو برا بین*
فەلەک کاری کرد لە یەک جیا بین

———

پام نالە رکاو* جوومە خوان زین
ولنگەیەک بنکەم چ کەژ* بیستین

پیتی " ت "

تۆم سپاردە دەس هەناسەی سەردم
وە جۆش و خرۆش دڵەی پڕ دەردم

———

تا کەی وەک گوڵ هاونشین خاری؟
تا کەی لە یار دوور رەفیق ئەغیاری؟

* خاو = خەو
* ئیشن = دەڵێن
* ئەڵوەن = ناوی رووبارێکە لە نزیک قەسری شیرین.
* گەشت و گێڵ = هات و چۆ
* باو = وەرە
* ئەڕای = بۆ
* کەرەند = ناوی شارێکە
* وێنە = وەک
* سەحنە = ناوی شارێکە
* هەجیج = پیرێکە لە هەورامان.
* پراو = ناوی کێوێکە لە پشت جیای بیستوون.
* بیستوون = کیوێکە
* بین = بوون
* رکاو = رکاب
* کەژ = کێو

تەنیا دارێک بیم کەنێک* لەپام بی*
گل گل* نازارەیل* دایم لەسام* بی
ئێستە پیر بیمە* بەڵگم* رزیایە*
گل گل نازارەیل لە لێم تۆریایە

---

بیتی "خ"

خۆم و دەماوەند* شەرتێکمان کەردەن
ئەو تەم و من خەم تا وە رۆی مەردەن

---

خۆزگەم وە خۆتان جێگەتان جەمە
هەزاری چوو* من لە لاتان کەمە

---

خوا مزانۆ* من وە پات چوونم*
سەد کوورەی ئاگر ها وە دەروونم

---

خالێ ها وە بان گۆنای راسەوە*
بەرزنجە* تێرێ وە موریاسەوە*

---

خوای بانی سەر کەریم خانی لەک*
مەعمورێ دەرکا بمان کانۆیەک*

---

بیتی "ج"

جەم لە شیرازە و سورمە لە کۆی توور
میل لە سولەیمانی ، کلدان لە مەغفوور
ناردم بۆت بێنن لە وڵاتی دوور

جەوەڵ* جەوەڵ گەل وەکوورِی دیمان
جەوەڵ هەر ماگن ئێمە پیر بیمان*

---

بیتی "چ"

چوومە جەم* بیستوون غەم بدەم بەرباد
دیم بە چاوی خۆم رەنجەکەی فەرهاد

---

چۆن شێویا لانەی دڵان پڕ داخان
جقجق* سیاماڵ* کۆرپەی لەیلاخان

---

چاوت " قەدەم خێر*" دووربینی ئالمان
لە قەسر ئەیخەی ئەڕای کرماشان

---

جراغ تۆڕیەکەی شەوەیلی* شارم
تۆ تەخسیر* نەیری خۆم سیا چارم

---

چەمەکەی* چەقان* پردەکەی کەولۆس*
گشتی وەقوروان خاڵەکەی پیرۆس*

---

چاویلی مەستت بێ سورمە* رەشن
هەر وەک هەسارە* روناک و گەشن

---

چاو رەشێ ، کاڵێ دیدە قەترانی
دەک ماڵت بڕمێ ماڵم رمانی

---

بیتی "ز"

زولفان بە وێنەی زولفی نازاران
چنوور ئاوێزان لە بەر مەغاران

---

بیتی "ر"

رەیحانە و رەیحانە ، خوشگل فراوانە
یە* دووسی* دیرم* مالیا لای بانە

---

رێکاکەم دوورە وام وە هەردەوە
ئەترسم بمرم بەی ئەم دەردەوە

---

بیتی "د"

دوو جەو* دیری جو* پیاڵەی چینی
لە قەسرەوە* خەی خانەقین* وینی

---

دەم قەن* و لۆ* قەن گشتی هەر قەنە
قەن فرۆش کەلەی قەنت وە چەنە؟

---

دەم گرد ، مەم گرد گشت گیانت گردەن
هیچ کەس وێنەی* من پەی* تۆ نەمەردەن

---

داڵکە پیرەکەم تەنیا من دارۆ
ئەگەر من نەوم خوا ئاگر مارۆ*

---

بیتی "س"

سکم* سپی کرد قامەتم چەمی
ئەویش لە داخی هاو چەشمان کەمی

---

سەرم چەرمگ* و ریشم تان* و پۆ
تا کەی بنیشم وەسای قەولی تۆ

---

سەروین کەچ کردی وە لای شەماڵدا
ماڵدار و بێ ماڵ گشت تەرکی ماڵدا

* کەنێک = کانی یەک
* بی = بوو
* گل گل = دەستە دەستە
* نازارەیل = نازدارە
* سا = سێبەر
* بیمە = بووم
* بەڵگم = بەرگم ، گەڵام
* رزیایە = رزا ،وەریوە .
* دەماوەند = کێوی دەماوەند .
* چوو= وەک

* مزانۆ= دەزانی
* چوونم = چۆنم
* راسەوە = راست
* بەرزەنجە و موریاس = دوو ناوچەن لە کوردستانی عێراق .
* کەریم خانی لەک = پێم وایە مەبەستی کەریم خانی زەندە .
* بمان کانۆیەک = بمانکەنەوە یەک .

* جەوەڵ = جەحێڵ،جەوان .
* بیمان = بووین
* جەم = لا، کن، نزیک .
* جق جق = دەستە ، دەستە .
* سیاماڵ = رەشماڵ، خێوەتی ئێلاتی کورد .
* "قەدەم خەیر"= ناوی کیژێکی تێکۆشەری کوردی لوڕ بووە .
* شەوەیلی = شەوانی
* تەخسیر = تاوان
* جەمەکەی = جۆم ،رووبار .

* چەقان = رووبارێکە لە بەینی سەید سادق و پێنجوێن دا .
* کەولۆس = ناوی پردێکە لە سەر رووباری چەقیان
* پیرۆس = پیرۆز
* سورمە = کل
* هەسارە = ئەستێرە
* یە = یەک
* دووسی = دوستێک
* دیرم = هەمە
* جەو = چاو

* جو = وەک
* قەسرەوە = مەبەست قەسر شیرینە .
* خانەقین = شاری خانەقین.
* قەن = قەند
* لۆ = لێو
* وێنەی = وێنە
* پەی = بۆ
* مارۆ = بباری
* سک = ردێن
* چەرمگ = سپی
* تان و پۆ=ماش و برنجی.

پیتی " ش "

شەرت بۆ لە داخت هەرگیز نەخەنم*
بەرگی ئازیەتی لە وەر نەکەنم

———

شەرت بۆ لە داخت هەریەی حالّم بۆ
بەرگی ئازیەتی سالّە و سالّم بۆ

———

شەوان مخەفم بیرم وە لاتیەن
دلّەی کۆس کەفتەم هەر وە تەماتەن

———

پیتی " ع "

عەشیرەت هۆ برایەل تیر بارانم کەن
وێڵی باخ و بێ... نازارانم کەن

———

پیتی " ف "

فرە حەز ئەکەم بە لەنجە و لاری
دیوانەمی کەرد چاوەیل خوماری
نە نیشتم تاوێک من وە کەناری

———

فەقیانە* چەرمگ* فرشتەی شەوی
شەوێ وەک ئیمشەو قەت هەلّ ناکەوێ

———

پیتی " ق "

قەسر و خانەقین بوونە بەخبەنان*
بوونە قاتڵ عام توولە نەمامان

———

کۆهەکەی بیستوون ئەڕام چو خاکە
ئەڕای دووری تۆ جەرگم چاک چاکە

———

کفتیە* وە بەرمان چەن کەش و چەن کو
مەگەر بای شەمال خەوەر با وە تو

———

پیتی " ک "

کەتیە* وە بەرمان چەن کەش و چەن کو
مەگەر بای شەمال خەوەر با وە تو

پیتی " گ "

گەردەن کەلەی قەن ، لوت* گولّە باغی
چاوت قەدەم خێر وەشایی باغی

———

گەردن مرواری ، کەنیل وەک بلوور
خو من حاکم نیم رات کیشم وە زوور

———

گەرمی و گەرمیان ، ساردی دەشتی وڕ
هات هاتی عێلی گۆران و کەلّوڕ

———

گل گل نازاران هاتن لە سەردا
ئاگریان لە مالّ جەسەی من بەردا

———

پیتی " ل "

لە پالّ کێف بیستوون دلّ دایم شادە
چونکە یادگاری شیرین و فەرهادە

———

مالّمان مالاّوسی* ، چێخێکمان بەینە
بۆچ من نەمزانی بەم کەینە و بەینە

———

مەواجە* دوورەن ، دووری بێ مەیلەن
وە دووریت قەسەم دەروونم کەیلەن*

———

پیتی " ن "

نالّەی دلّ فەرهاد دەرهات لە بیستوون
سەدای ئەو نالّە منی کرد مەحزوون

———

نە شەو راحەتم ، نە رۆژ دلّ شادم
یادی خەیالّی نازوێ لە یادم

پیتی " و "

وەتریقەی برنەو سنە چۆلّ ئەکەم
ئەی شەوڕە لە بان بالاّی تۆ ئەکەم

———

پیتی " ه "

هەر مالّێ گیسکێ ، خۆم تەنیا کۆڕێ*
نەزری ئەلّلاّ بێ ، یارم نەتۆڕێ

پیتی " ی "

یاران ، هامسەران ، رەفیقان ، ئامان
زامانێ سەختم نیەسی دەرمان

.... پاشماوەی جووجە کەباب

ئەگەر راستتان دەوێ ئێستاش هەر- کاس بووم . بابێک مندالّەکەی دەردەکا دەستێک خانووبەرەی زیادی هەیەبیداتێ خودایە شوکر ، بابی خودالێخۆشبووی منیش کە لە سەرەمەرگیدا وەسیەتی کرد تەنیا سەعاتێکی هەبوو کە بەندەکەی زێو بوو . فەمووی ١٥ هەزار- تمەن قەرزدارم ئەوم بۆ بدەوە سەعاتەکەشم بە مامۆستای بەخشیوە کە هەموو رۆژێ ٢ سەعات قورئانم لەسەر قەبری بخوێنێ .... بە دەم ئەو فکرا- نەوە گەیشتمە بەر دووکانی کابرای مریشک فرۆش کۆپینەکانم دایە و هەشت مریشکم وەرگرت . هەوەلّ جار بوو شتی وام دەدی . ئەو مریشکانە دەتگوت هێلکەن و لە نایلۆنیان وەرگرتوون دووسێ جارم یەکیان سەروبن کرد بەلاّم نەمزانی کوێی بە سەر کوێیەوە . هەتا کابرا بۆ خۆی لە فریام هات ووتی پاش وەی لەئاوی کولّیوی بنێی سەهۆلّەکە دەتوێتەوە و ئەو جار بە کەیفی خۆت لێی بنێ. هەر کە مریشکم بردەوە مندالّ وە تلیتلی کەوتن . خێزانم هێنای پاکی کرد و لە کیسەکەی دەرهێنان ولە پیوازی گرتن . هەتا ئێوارێ

ل ٨٩

* نەخەنم = بێ نەکەنم
* فەقیانە = سۆرانی کراسی ژنان .
* چەرمگ = سپی
* بەخبەنان = سەهولّبەندان
* کەفتیە = کەوتوتە
* لوت = لیو
* مالاّوێی = جیرانی هاوسێ.
* مەواجە = مەلێن
* کەیلەن = خەم بادن
* کۆڕ = شەک

# ئێمە و خوێنەر

سوپاس بۆ خودای مەزن کە دەستی گرتین تا بە هاوکاری ئێوەی خۆشەویست ئەم گۆوارە رێک و پێک بکەین، بێگومان ئەگەر بە یارمەتی ئێوە نەبایە هەرگیز ئەم کارە بە ئێمە نەدەکرا ، ئێمە خۆ بە منەتبارتان دەزانین بەڵام ئێوەش نابێ لە خۆ بایی بن ، چونکە ئەوە ئەرکی هەموو کوردێکی پاک و چاکە کە هەر چەندەی لە دەستی بێ خزمەت بە زمان و فەرهەنگی کوردی بکا ،کەوا بوو ئێوە دوو کارتان وێکڕا ئەنجام داوە، هەم لە هانای ئێمە هاتوون و هەم خزمەتی کوردی بێ بەشتان کردوە ، خوای گەورە لە هەر دوو دنیا پاداشی چاکتان بداتەوە . بە پێویستمان زانی هێندیک شتتان عەرز بکەین .

۱. رەنگبێ زۆرتان لەو نووسینە بگەڕێن کە بۆتان ناردووین‌ونەیدۆزنەوە بەڵام ئەوە بەڵگە نیە بۆ ئەوەی کە نووسینەکەی ئێوە کز بووە. زۆر شتی باشمان بۆ هاتوون کە هەڵمان گرتوون بۆ ژمارەکانی داهاتوو .

۲. تا ئێستا زۆر لەوانەی دەستیان قەڵەم دەگرێ بێ ئەوەی شتێکیان بۆمان ناردبێ رایانگەیاندوە چاوەڕوانن بزانن یەکەم بەرهەمی ئێمە چۆن دەر دەچێ تاکوو لە داهاتوودا هاوکاریمان دەگەڵ بکەن ، بێ گومان زۆر لەوانەش کە پەیوەندی یان دەگەڵ نەگرتووین هەر ئەو چاوەڕوانی یەیان هەیە . گلەیان لێ ناکەین کە بۆچی بۆ دەرچوونی یەکەم بەرهەم یارمەتی یان نەداوین ، بەڵام داوایان لێ دەکەین بۆ باشتر بوونی گۆوارەکەمان لەمەودوا دڵسۆزانەتێبکۆشن و قۆڵی لێ هەڵماڵن .

۳. رەسم وایە کەسێک شت بۆ رۆژنامە و گۆوار دەنێرێ هەر لە دیویکی کاغەز دەنووسێ ، بە داخەوە بەشی هەرە زۆری ئێوە ئەو رەسمەتان لە پێش چاو نەبوەو ئێمەتان تووشی دەردی سەری زۆر کردوە بەڵام ، ئەو جار بە قوربانی چاوی ئێوە بێ ، ئەمما بۆ جارێکی دیکە دەبێ هەر لە دیوێکی کاغەز و بە خەتێکی روونا ک و جوان شتمان بۆ بنووسن . تەنانەت ئەگەر بۆ خۆتان خەتتان خۆش نیە دەکرێ لە دۆستان یارمەتی وەربگرن ، هەموو کارێک لە پێشدا کەم و کووڕی تێدایە . دیارە گۆوارەکەی ئێمەش هەروایە . بەڵام بە هیواین ژمارە بە ژمارە بەرەوباشتر بوون بڕوا .

۴. دەستەی نووسەرانی گۆوار لە نێو ئەو شتانەیدا کە پێی گەیشتووە هەر مەتڵەبێکی بۆ هەر ژمارەیەک پێ باشتر بێ دیاری دەکا و بە ناوی خاوەنەکەی بڵاوی دەکاتەوە .

ئێمەش وەک دەستەی نووسەرانی هەر گۆوارێکی دیکە لەباری ئەدەبی و رێنووسەوە ئەگەر پێویست بێ دەسکاری نووسراوەکان دەکەین ، بەڵام نێوەرۆکی مەقالەکان ناگۆڕین . نووسەر بۆ خۆی بەرپرسی نێوەرۆکی مەقالەکەیەتی و هەر بۆ خۆیشی دەبێ وەڵامی رەخنەی خوێنەرا ـ نی بداتەوە .

۵. هێندێک لەو نووسراوانەی گەیشتوونە دەستمان بریتین لە بەیت و مەتەڵ و گۆرانی و شتی دیکەی فۆلکلۆری ناوچە جۆر بە جۆرەکان کە یا لەبەر لەهجەکان ، یا بە هۆی لە بەر چاو نەگرتنی ئوسوولی رێنووسی کوردی لە لایەن نووسەرەکانیانەوە بۆ کەلک لێ وەرگرتن نابن ، بۆ لەنێو چوونی ئەم کۆسپە پێشنیار دەکەین جگە لەوەی ئوسوولی رێنووسی کوردی بە تەواوی لە بەر چاو دەگرن ئەو جۆرە بابەتانە لە سەر شریت زەبت بکەن و دەگەڵ نووسراو ـ ەکە بۆمان بنێرن .

۶. هەر چەند ئەم گۆوارە بۆ یەکەم جار دەردەچێ و بەهیوا نەبووین پرسیاری وامان بگاتە دەست کە وەڵامی بدەینەوە بەڵام چەند پرسیارمان بۆ هاتوون کە نەدەکرا بێ وەڵامیان بهێڵینەوە . هیوا دارین بۆ ژمارەی داهاتوو ، هەم رەخنەی بەجێ لە ئێمە و لە نووسەرو شاعیرەکانی هاوکارمان بگرن و هەم پرسیارمان لێ بکەن. ئێمە لە رەخنەی بەجێ پێشوازی دەکەین ٥

کاک خالیدی بهرووز لە مەهاباد ەوە داوای وڵام دانەوەی ئەم سێ پرسیارەی لێ کردووین .

۱. بۆ نووسینی چیرۆکی کورت دەبێ چ لەبەر چاو بگرین ؟

۲. لەو هەل و مەرجەدا چ مەسایلێک دەبێ ببێتە سووژەی چیرۆک ؟

ل ۸۹ ←

تێبینی : لە پڕ کردنەوەی ئەم جەدوەلەدا هەموو ئوسوولی ڕێنووسی کوردی بە پێی ڕێنووسی هەڵبژێردراوی ئەم گۆوارە رەچاو کــــراوە جگە لەوەی نیشانەی(ٚ) دانەنراوە.واتا ئەگەر بۆ وێنە وشەی( شڕ، گوڵ،زۆر ،شێرو . . )ی تێدا بێ بە شکڵی(شر ،گول،زور ،شیرو . . )دەنووسرێ.

١ ـ صلاح الدینی ئەییووبـــــی ســـــەرداری موسڵمانی کورد بەرنگاریان بوو ـ لــبــاد. ٢ ـ ناوی شالوارێکی خاریجیەیە ـ دۆست ـ هەر کەس لــە بڕی نەکاتەوە هیچ نازانێ ـ ژوورێکی فرەوانە لە نێــو خانوودا . ٣ ـ پێتەختی تەببەت ـ داستانێکیدراماتیکی بە ناو بانگ لە ئەدەب و فولکلۆری کوردیدا .٤ـ بەڵــێ بە زمانی بێگانە ـ ئیملا ـ یەکێک لە کــەرستـــە زۆر پێویستەکانی ساختمانی . ٥ ـ ژووری گـــــــەورەی دەوڵەمەندان ـ مەلەی بکەی دەتەوێ ـ بەر. ٦ـ نەخــۆش دەیگرێ ـ هاتەران پاتەرانی نەخۆش و خەواڵــــــوو ـ شارەزا و پسپۆڕ. ٧ ـ جوولەی توندی هەوا ـ پشــووی پێدا دێ ـ بە نرخ. ٨ ـ دەریاچەیەک و شارێک لــــــە کوردستانی تورکیادا ـ کات و زار ـ شــــارێکی نزیــک بە تاران . ٩ ـ نە گیایە و نە دڕوو بەڵام وشـــتــر دەیخوا ـ یالەوانی چیرۆکێکی فۆلکلۆریک ـ قووڵایـــــی. ١٠ ـ شارێک و دەریاچەیەکی بە نـــاوبـــانگ لـــــە ئێراندا ـ جامەلووسکی و دوو ڕوویی ـ وارشــی دەوری چاک ـ یەکێک لە دەغڵەکان . ١١ ـ سەگی نەخۆش ـ کچ لە هێندێک شێوە زمانی کوردیدا ـ مانگێکی ساڵی قەمەری. ١٢ ـ پڕ ـ گەڵ وگای نێوچاوان سپی ـ یا خوا ئی کەس گران نەبێ. ١٣ ـ رووت و رەجاڵ ـ کڕین بە زمانی فارسی . ١٤ـ بە گژ هەموو کەسدا دەچێ ـ بــێ دەنگ ـ دەڵێن هەر رۆژێکی هەزار ساڵە ـ ئی راستبگری باشە . ١٥ـ برایەکی ئیمام رەزایە کە لە هەورامان نێژراوە. ئامرازکی جۆلایی.

١ ـ یەکێک لە ئەسحابەکانی پێغەمبەر ( د.خ ) کە زۆر ئازا بووە. ٢ـ یەکێک لە سەرانی نازی کە هێشتا لە بـــــەنــد دایە ـ یازدە ـ دژی باش ـ گە گرتنی ئەسپ . ٣ـ دوو برای زستانی ـ زەمیرێکە ـ ئاواتی دڵەو ناوێکە بۆ پیاو.٤ـ دەگــەڵ سوار نابنە ئاوەڵ ـ شاعیرێکی هەرە پایە بەرزی کورد ـ لە کەوشی دەدەن . ٥ ـ بەخشێکە لە شیمالی کوردستانی ئێراندا ـ میــــچ دەیکا و لە بۆڵەی زڕباب ناخۆشترە. ٦ـخوویەکی ناپەسەندە و بەڵای گیانی کۆمەڵە ـ سەرەکەی وا نەبا چێشتێکی خۆش بوو.٧ـ نــیوەی سارد ـ میوەیەکی پاییزی ـ یەکێک لە سەرچاوە هەرە گرینگەکانی فۆلکلۆری کوردی ـ باقۆ. ٨ ـ پارچەیەکی گران بایی ـ ژمارەیــەکە ناگاتە دە ـ پێشگرێکە لە کوردیدا نیشانەی گەورەییەـ " بیشە " ی تێکەڵ . ٩ـ ئێمە ـ مانگا بمرێ ئەویش دەبڕێ ـ ماڵـــنــبــی قەرزداری لێ کەوتوو وا لێ دەکەن. ١٠ ـ ناوی کۆنی وڵاتی ئوتریش ـ ئیختیراعی گرینگی ئەدیسون ـ نێر نیە.١١ـ فەرماندەی ئەڵمانی لە شەڕی ئەفریقادا کە بە ڕێوی سەحرا ناوبانگی دەرکردبوو ـ حاڵەتی مار لە زستاندا ـ گراوی سیامەند.١٢ـ گوندێکی کوردستانکە شوێنەواری سەردەمی مانیاکانی لی دۆزراوەتەوە ـ بناغە و ئەساس . ١٣ـ تەرم و جەندەک ـ ناوێک بۆ ژن ـ مۆرەی لێ تـــوند دەکرێ ١٤ ـ دنە ـ قام و گۆرانی بە لەهجەی شیمال ـ دورگەی عەرەب ١٥ـ مەکۆی شادی و غەم ـ شاعیر و عارفی مەزنی گۆران کە لە سەدەی هەژدەهەمدا ژیاوە و شیرین و خسرو یەکێک لە بەرهەمەکانیەتی .

# دیاری

## پەندی پێشینان

* گیا لەسەر بنجی خۆی دەڕوێتەوە.
* ئەگەر لە کانییەک ئاوت خواردەوە بەردی تێ ماوێ .
* لە ئاوی خوڕ مەترسە لە ئاوی مەن بترسە.
* چ بچێنی ئەوە دەدروویەوە.
* گوڵ بێ دڕوو نابێ .
* بە گوڵیان گوت : بۆ وا گەشی ؟ گوتی : باخەوانەکەم مەردە.
* بە با و بە بارانێ هەر لە تەمەنی بەفر کەم دەبێتەوە.
* ئەگەر گوڵ نی دڕوو مەبە .
* ئەوەی دڕکان بچێنێ نابێ بە پێخواسی بڕوا.
* گەورە ئاو دەڕژێنێ ، گچکە پێی لێ دەخشێنێ .
* هەر دەوەنە دەبێ بە دار لەبنی دادەنیشێ فەقیر و هەژار.
* بە گوڵێکی بەهار نایە.
* گۆم هەتا قووڵتر بێ مەلەی خۆشترە.
* لە بەهاری نەهاتوو لە کەوی نەگرتوو.
* لە سایەی جلە گەنمێک سەد جلە جۆ تێر ئاو دەبێ .
* ئاو بت با لە پردی نامەرد مەپەڕەوە.
* هیچ گەنجێک بێ مار نیە، هیچ گوڵێک بێ خار نیە.
* باران دەبارێ ئاشی دەگەڕێ، باران نەبارێ جووتی دەگەڕێ.
* ئاقلێ سڤک بارێ گرانە.
* ئاقل تاجێ زێڕینە ، لێ سەرێ حەموو کەسی‌نیە
* ئاڤ ل گۆلادا بمینە وێ گەنی ببە.
* ئەز لجیاتێ لجیبا ، لێ کێژ گولێکارا هەرت‌گیبا ؟
* ئەوێ هێنترا بکرت ،دڤێ سەرئەرا خانیێی خوەبلند بکە.
* ئەگەر ئاخافتن زیڤ بە نەئاخافتن زێڕە.
* ئەوێ تلیێیا خوە بێخت‌گوهێ خوە ،دزانتکا وێ چی بێژت.
* ئەوێ بلند بفرت‌وێ ئژم بکەڤت.

## مەتەڵۆک

بزانە چیيە ئەڤ خۆش مەتەلۆک<br>
بینە بیرا خو پڕکا تەمبەلۆک

ئەو جان ل بەرە خوژی سۆمەکار (١)<br>
هەمێشە دزی ناڤ گۆل و رووبار

قەت‌قەت نکارە ناڤ‌ئاڤێ دەرێ<br>
گاڤا کو دەرهات‌دچە ناڤ فەرێ (٢)

بێ پێ و دەستە ، رووت و بێخاسە<br>
گەڕا ئاڤێدا خو ڕا دلخازە

پەڕکێ وێ هەیە ، لێ قەت نافڕە<br>
دەڤێ وێ هەیە چ جار ناقوڕە

خەرزا (٣) ددانێن ، هندک ژی دزێن<br>
ب ئاڤە سێهکێ (٤) خۆش‌وە ددەبێهن

دچن نێچیرێ ، ب تۆڕ و چەنگال<br>
دکن ناڤ‌شووشێ ل جەشنا سەر سال

ئەگەر نکاری هێژی بناسی<br>
بێ تە نێکەم ئاڤێ، هەر وەکی ماسی

---

١ ـ سومەکار= مەلەوان . ٢ـ فەر= دەفر، ئامان. ٣ ـ خەرز= گەرای ماسی<br>
٤ ـ ئاڤە سێهک = ( سی )ی ماسی(آب شش)

تا سەری نەبڕی نایەتە گوفتار<br>
تا خوێنی نەڕژێ نایەتە وتار<br>
لەگەڵ ئەوەشدا بێهۆش و گیانە<br>
بە دەس‌زاناوە قسەی رەوانە

کە هاتە دەر لە مەشکە<br>
بکوڵێ شیرێژ و کەشکە<br>
خۆشە بمێنێتەوە<br>
وەک ئاو دەخورێتەوە<br>
بەڵام زۆر جاری وایە<br>
دەستی دە دەستت‌دایە<br>
نە دەخورێ و دەخورێتەوە<br>
ئەو بێ دەڕازێتەوە<br>
لە نێو ئەژمێر و پێوان<br>
جواری لەت‌کە لە نێوان<br>
بە فارسی بیخوێنەوە<br>
نەهێنیم هەڵێنەوە

## قسەی خۆش

### گوێ بەراز

قانیعی شاعیر زۆر رووت دەبێ ئوستانداری سلێمانی بۆ ئەوەی بزانێ ، تفەنگ ماوە یا نا رادەگەیەنێ هەر کەس گوێ بەرازێکم بۆ بێنێ پینج دیناری دەدەمێ ، قانیع کە هیچ شک نابا تفەنگێکی رەشۆکی پەیدا دەکا و خۆ لە نێو مەرەزا دا مات‌دەدا . تا چەند بەراز دەکوژێ و گوێیەکانی بۆ ئوستاندار دەبا . ئوستاندار زۆر بەخێرهاتنی دەکا و دەڵێ ماموستا گیان پێم نالێی ئەو بەرازانەت بە چی کوشتوون؟ قانیع دەست‌بەجێ لە دەهۆ دەگا و دەڵێ : قوربان من مەلام بە زەکاتیان داومێ !

### ئاو داشتنی هێمن

هێمنی شاعیر لەم ساڵانەدا جارێک لە جێگایەکی خوڕێن وشۆنە ئاو دەدێرێ . ئاوەکەی بۆ راناوەستێ دەچێ لە کەنداڵێکدا خۆ مەڵاس‌دەکا و کابرایەک هەرای لێ دەکا : هۆی ماموستا ئاوەکەت بەخۆڕایی دەڕوا . هێمن دەڵێ:

ـ کوڕە خۆم لێ شاردۆتەوە پێی مەڵێ .

### دڵی داکشاو

بەکێک لە وەزیرە دلڕەقەکانی ئینگلیسی بەردی مووسڵدانی بوو ، بە بیرنا ردشاویان گوت . گوتی :

ـ هیچ نیە دڵی تۆزێک داکشاوەتە خوار !!

سپاسی خوشکە نازداری غەفووری ، کاک سمایلی قەززاق ، کاک سەلاحی عەرەبی و کاک ئازاد عیسا دەکەین کەلە دیارییەکانیان کەلکمان وەرگرتووە

خودا لێ خوشبوو حەسەن نادر یەکێک لە پیاوە هەرە قسە خۆشەکانی شاری مهاباد بووە و سەرەڕای دەستکورتی و نەداری دڵێکی سامانداری بووە. رۆژێکی بۆی گێڕامەوە گوتی جارێکی رەمەزان بوو منیش زۆر وەڕەز بووم و رۆژیش زۆر درێژ بوون و نەدەبڕانەوە تەمەشام کرد لەو حاڵەدا کابرایەکی رووتەڵە هاتە لام و گوتی : کاکە ئەتۆ خەڵکی شاری و منیش زۆر دەستکورتم. پرسم بە چەند کەسان کردوە و ئەوانیش ئێونیشانی تۆیان داومێ. جا یان رێگایەکم پێشان دە یان پووڵێکم بۆ کۆ کەوە منیش کە هیچم بە جەرگەوە نەبوو گوتم : برالە لە لای ئێوە کیسەڵ نیە ؟ گوتی : چۆن نیە؟ گوتم : خەڵکی شار کیسەڵیان زۆر خۆش دەوێ ئەگەر بێتوو جەواڵێک کیسەڵ لەگەڵ خۆت بێنی چاک دەفرۆشرێ ، بەڵام لە بیرت بێ هەموو بەقەت یەک بن .

بەڵێ کابرا پاش بیستنی ئەو قسەیە رۆیشت و گوتم : حەتمەن حاڵی بووە و تێگەیشتوە کە هیچم لێ هەڵناوەرێ . بەڵام زۆر بە سەرسوڕمانەوە دیتم بەیانی کابرا گوێدرێژێکی پێیە و بارێکی کیسەڵ بە بەقە تەق لەبەر دوکانێ هەڵڕشتوە. چارەم بڕا و زانیم کە ئەو کابرایە زۆر نەدارە و لە گاڵتەکەم نەگەیوە و کیسەڵی هێناوە. هەستام چووم لەبەر دووکاندارەکان پاڕامەوە هەتا هەر یەکەی بێ و کیسەڵێک بکڕێ .هەم ئەوانم لە کۆڵ بێتەوە و هەم کابراش بە نەوایەک بگا . سەرتان نەیەشێنم . گوتی : بە هەر جیرەبابەیەک بوو کیسەڵمان فرۆشت و بە کابرام گوت : بڕۆ ئەوە پووڵت وەرگرت تازە نەتبینمەوە .

بەڵێ کابرا رۆیشت و ئەوجار کیسەڵەکانمان برد لە دەشتی بەرەڵڵا کرد و گوتم : ئۆخەی ئەوە نەمردم کارێکی باشم کرد و کەسێکم رازی کرد ئەوێ ئەوێ بە خەیاڵی ئاسوودە لێی نوستم. بەیانی کە لە خەو هەستام و هاتمە دووکانێ تەمەشام کرد ئەش حەوت بار کیسەڵ لەبەر دووکانێ راوەستاوە و وایان زانیبوو بەڕاستی کیسەڵ فرۆشم .

نووتن

ئاخر نووتن زەمانێکی زۆرقاچاغ بوو، هەر کەس نووتنی بایە دەبوو تەحویلی دوخانیەی بدا . رۆژێک کابرایەک تایەک تووتن دێنێ و لە نزیکی سەددی مەهاباد لەو جێگایەی تاقەداری بێدەڵێن راپۆرتی لێدەدەن و دەیگرن. پاش چەند رۆژان لێی دەپرسن و لەبەر خاتری ئەوەی کە یەکەم جاری بووە نووتنەکەی دەدەنەوە . رەئیسی دوخانیەی پێی دەڵێ : کوڕە ئەوە ئاخر جارت بێ تازە ئیدی لەو دەور و بەرە نەتبینمەوە ! !

ئەویش کە خودا خودای بوو رزگاری بێ دەڵێ : وەڵڵاهی قوربان شەرت بێ بە شەرتی پیاوان ئەتۆ ئەو چاکەیەم لەگەڵ بکەی هەتا رووحی قاسمی لەدنیادا زیندوە ئەگەر تەواوی کارمەندەکانی سەددێ بمرن ناچمە سەرە خۆتی .

شاهیدی

شاهیدیان بردە لای بازپورس
لێی پرسی :
– ئەو بەردەی مارف بە سەری سێمانیدا دا ، چەند گەورە بوو ؟
– چوزانم ، زۆر گەورە بوو .
– مەسەلەن وەک سەری من دەبوو؟
– بەڵێ ، بەڵام پتەوتر بوو !!

# نەخۆشی ژنان

کابرایەک بۆ دەس نوێژ دەچوو — کاری زۆر بە پەلەی هەبوو
پیرێژنێکی دی لە رێدا — ئەویش رادەبرد بە وێدا
هەر چەند کە زۆریش تەنگاو بوو — چونکە پیرێژن ناسیاو بوو
ناچار هەروا کە رادەبرد — سەبرێک سڵاوێکی لێ کرد
راش نەوەستا لەسەر وەڵام — پیرێژن یەخەی گرت بەڵام
هاتە پێش گوتی : ببوورە — براکەم نەقڵێ من دوورە
دوکتۆر بەمنی ئەسپاردووە — من تەرکی قسەم کردوە
هەر بێتوو کەسێک بدوێنم — بەرز دەبێ پلەی خوێنم
کز دەبێ رووناکی چاوم — تێک دەچن دڵ و هەناوم
ژان لە سەرم بڕواتە دەر — کۆخە رەشەم دەگاتە ئەر
جا مەبەستم دڵی تۆیە — من ئەو دەردەم لێیە بۆیە
ئەگەر کەسێک رووم تێ دەکا — وەک تۆ سڵاوم لێ دەکا
ناوێرم خولاسەی کەلام
بڵێم ( وە علیک السلام )

# بەبۆنەی بۆردمانەکەی قەڵادزێ

شەوێکی بەهاری رەنگین و خەملیو، شارە گچکە، جوان وخونچیلانەکەی قەڵادزێ، لە باوەشی چیا سەربەرزەکانی ئاسۆس و قەندیلدا لە شیرین خەوی بەهاریدا بوو، راستە ئەم شارە کەمتر لە پەلاماری دوژمنانی کورد لە ئەماندا بووە و خەڵکی ئەم شارە کەمی ژیانی ئاسوودە و خۆش دیوە، بەڵام ئەوێ شەوێ کەس بیری نەکردەوە بەیانی چدەقەومێ؟

بەیان ئەنگووت، شار کەوتە جوولە و بزووتن. کرێکاری زەحمەتکێش ئامرازی کاری دەسدایە و بە دوای کاردا رۆیشت موەززەفەکان چوونەوە پشت میزەکانی دایرە. مامۆستاکان لە قوتابخانەکان بە دڵ و داو خەریکی بار هێنان و فێر کرنی منداڵ ومێرمنداڵەکان بوون بەو هیوایە بەرەیەکی خوێندەوار زانا و ئاگادار بۆ دوارۆژی کوردستان پێ بگەیەنن. دووکاندارەکان دووکانیان کردبۆوە و کاڵای جۆربەجۆریان بۆ موشتەرییەکان دانابوو. کۆرپە نازدارەکان هێشتا لەخەوهەڵنەستابوون و بزەی شیرین و دڵگریان لەسەر لێو بوو هەر خوا دەزانێ خەونیان بەچییەوە دەبینی؟ ئەوان کوا دەیانزانی دوژمنێکی فاشیست و ملهوڕیان هەیە، کە رقی لە ئینسانیەت بەتایبەتی لەکوردە، ئەوان کوا دەیانزانی، کۆمەڵێک خوێنرێژ، پیاو کوژ و دڵرەق هەن کە بەزەیان تەنانەت بە بزەی شیرینی ئەوان نایە. ئەوان بەعسی مەزنیخوازی جانەوەری خۆ پەرستیان کوا ئەناسی؟

سروە ٨٨

رۆژی چوار شەمۆ ١٩٧٤/٤/٢٤ بوو کە رنوو بەفرەکانی قەندیل بە تیشکی هەتاوی بەهاری دەبریسکانەوە و شنەی فێنکی ئاسۆس بۆن و بەرامەی گوڵو گیا بۆنخۆشەکانی بڵاو دەکردەوە، لە پڕ سێ فڕۆکە ئاسایشی شاریان شێواند هاڕەی خۆیان، گرمەی بۆمبیان، قرمەی شەستیریان کردیە رۆژی رەش. تەنیا لە مەودای ٣ دەقیقەدا، شاریان شڵەقاند، ژەهری رق و کینەیان باراند و دەیان ئینسانی بێگوناە و تاوانیان لە خوێن گەوزاند.

ئاگر و ئاسن لە باتی رێژنە بارانی بەهاری داباری، جەستەی شلک و چڕی دەیان منداڵ و لاو و پیریان ئەنجن ئەنجن و ریزاڵ ریزاڵ کرد. دووکەڵی خانووی سووتاو، بۆنی باروت ،وچزەی لاشەی برژاوی خەڵکی بێتاوانی ئەمشارە هەتا هەتایە لە بیر ناچێتەوە.

بەڵێ تەنیا لە ماوەی ٣ دەقیقەدا دڵی پاکی پڕ لەهومێدی ١٣٢ کەس لەلێدان کەوت، گیانی پیرۆزی ١٣٢ ئینسان بەرەو نەمان چوو .چەند خێزانی گەورەی وەک مالی " ئەحمەدی حاجی سابیر" رەسووی مام ئەحمەد" قادری وەستا ئەحمەد" حەسەنی حاجی مەحموود" و .... بە جارێک بنەبڕ بوون. چەند ئافرەتی دووگیان بەخۆیان ومنداڵە دنیا نەدیتوەکانیانەوە لە ژێر دار و پەردوو وکونکرێتی خانوودا پلیشانەوە چەند لاوی دڵ بە دنیا خۆش و مایەی هیوای گەل بە هەزاران ئاواتی زێڕینەوە

چوونە ژێر گڵ. چەند کیژی نازداری ، لەباری ، شەرمین لاشەکانیشیان نەدۆزراوە.

کێ هەیە، قوباد و پێشڕەو و جەمال و شەونم و خەدیجە و ئەوانی دیکەی لەبیر بچێتەوە کە گوڵی سەر تۆپی شار بوون. کێیە کوڕی هۆمەرە کەرِی لەبیر بچێتەوە کە تەنیا بە دەنگی تەقینەوە دیوارێکی بەسەردا هات و راست نەبۆوە ئەدی چون ئەو دیمەنە سامناکەی ئەحمەد مریەم لەبیر دەچێتەوە کاتێک بەرێگادا دەڕۆیشت پارچە بۆمبێک سەری پەڕاند و دیتیان چەند هەنگاو بێسەر هەڵات؟

ئەدی ئەو دووسەد بریندارەی کە زۆریان دەست و لاقیان پەڕی یا شیت ،و کەڕ و لاڵ بوون؟ پتر لە یازدە خانوو و بیست دووکان دەگەڵ خاک یەکسان کران.

بەڵێ تەنیا لە ماوەی ٣ دەقیقەدا روخساری شار گۆڕا، پێکەنین و شادی بوو بە شین و شەپۆڕ، ژیان خۆشی خۆی لە دەسدا ، مەرگ، ترس و سام،باڵی بەسەر شاردل کێشا. لاشەو جەستەی کوژراو و بریندار لە شەقام و کۆڵان کەوتبوون. هی وامان دیتن بێ ئەوەی برینیان هێنابێ دڵیان تۆقیبوو.

ئەوەیە ئاکاری نالەباری فاشیزم، لە بەعسی فاشیست جگە لە کوشت و بڕ و ماڵ وێرانی چاوە نۆڕی چ دەکرێ؟

بەڵام ژیان فێری کردووین کە مێژوو بەسەر کەسدا باز نادا. سەرەنجام بەشی هەموو دیکتاتۆرێک نەمان و لەنێوچوونە و جێگای هەر ملهوڕێک زبڵدانی مێژووە و ژیانی خۆش و دوا رۆژی رووناک و سەربڵندی هەر بۆ چەوساوانە.

## هێمن

# بەهاری زەرد

هەمیشە دەرد دەبینم ، دەرد دەبینم
درۆی دژمن ، دەهۆی نامەرد دەبینم
مەگەر زەردایی ناکەن چاوەکانم
کە رەنگی نەوبەهاری زەرد دەبینم
بە سۆزەی با کە سکڵێ دڵ گەشاوە
دەروون پڕ سۆز و فرمێسکم خوناوە
لە دووی لەیلا بە واویلا و شیوەن
دەڕۆم و پۆلی شین گێڕم بە دواوە

* * * *

بزەی هاتێ گوتی : رووناکە ئاسۆم
وەرە جەللاد پەتت باوێژە ئەستۆم
ئەوە پەت نیە میداڵی ئیفتیخارە
کە بوومە قارەمانی میللەتی خۆم
ئەوەی بیست شاعیر و گریا بە زاری
ئەگەر چی بەسترا بوو لێو و زاری
گوتی : لەیلا هەمیشە پایەداری
لە ژێر خاکا لە پێش چاوان دیاری:
کە تۆ تۆرای لە چاوان وەک خەوی من
لە بسکت رەشترە مانگە شەوی من
بڕۆ مەجنوون بە لەیلای خۆت مەنازە
کە ناوبانگی پتر رۆیی شەوی من

.... پاشماوەی ئێمە و خوێنەر

٣. لە بارەی نووسینی چیرۆکی سیاسی ، و عیشقی یەوە بە کورتی رێنوێنیمان بکەن .

هەر چەند بە جیاواز جوابمان دابۆوە بەڵام چونکە ئەو پرسیارانە رەنگە بۆ زۆر کەسی دیکەش بێتە پێش لێرەشدا وەڵامی ئەو پرسیارانە دەدەینەوە .

برا گیان : چیرۆک نووس دەتوانێ لە دەور و بەری خۆی بۆ چیرۆکێکی ریئالیستی یا واقیعی ئیلهام وەربگرێ بەو مەرجە سووژەکەی لە شتی باشی کۆمەڵ وەرگرتبێ یا بە پێچەوانە شتی خراپ بکوتێ ، بەڵام :

بە زمانێکی ئارام و شیرین ،

بە بڕوای ئێمە کەم و کووڕی کۆمەڵ و زوڵم و زۆر ، و شتی وا چاکترین سووژەی نووسەرانی لاوە بۆ چیرۆک نووسین ، چیرۆکی سیاسی دەبێ ئینتیقاد لە دۆستان و هێرش بۆ دوژمنانی تێدابێ و دۆست بە هەمووعەیبەوە نیشان بدرێ و رەخنەی بەجێ و دۆستانەی لێ بگیرێ و دوژمن دزێو نیشان بدرێ و خەڵک بۆ خەباتلە دژی ئەو هان بدرێ، چیرۆکی عیشقی دەبێ دوور لە قسەی هەرزە و بێ عیفەتی بێ و عیشقی پاک و ئینسانی نیشان بدا .

خوێنەرێک کە ویستوویەتی بە کاک هەباس ناوی بەرین نووسیبووی :

ـ پیاو چۆن دەبێ بە شاعیر و شیعرچیە؟

وەڵامی ئەم پرسیارە تا ئێستا بە هەزاران نووسراوە نەدراوەتەوە ، بەڵام بە کورتی عەرزی دەکەین . شاعیر ئینسانێکی حەساسترە لە خەڵکی ئاسایی و دیتنی دەور و بەری خۆی هانی دەدا کە هەستی خۆی دەرببڕێ. شیعری باش ئەوەیە جوانتر توانیبێتی هەستی شاعیر لە سەردەمی خوڵقانیدا نیشان بدا . بۆ نموونە ئێمە هەمووما ن دیومانە رۆژ چۆن ئاوا دەبێ ئەمما کێ وەک نالی توانیویەتی ئەم مەبەستە بخاتە چوار چێوەی شیعرەوە .

**لەخەوفی تەلعەتت رۆژ هەر وەکوو شێت**
**بەروو زەردی هەڵات و کەوتە کێوان**

کاکە گیان ! بە بڕوای ئێمە شیعر هەر بریتی نیە لە وەزن و قافیە تەنانەت ئەگەر زۆر جوانیش بێ ، بەڵکوو بریتی یە لە دەربڕینی هەستی ئینسانێک جا چ شاد بێ و چ خەمناک . نەزم هونەرێکی گەورەیە بەڵام دەگەڵ شیعر جیاوازی هەیە. بۆ ئەم مەبەستە پتر موتالا بکە.

.... پاشماوەی جووجە کەباب

ئێوارەێ دەستمان کرد بە برژاندنیان . منداڵە هاج و واجەکان دەتگوت برسی ساڵی گرانین .ئەوسەر یان دەکرد دەیانگوت تەواو نەبووە لەوسەرێ دەگەڕانەوە و دەیانگوت: نەبرژی ! هەر ئەوەندەم زانی چڕە دووکەڵ و بۆ چرووک لە ژووری گەڕا و منیش دەلاقەکەم کردەوە هەتا هێندێک بۆ چرووک وەدەر کەوێ بەڵام بریا وام نەکردبا !

منداڵە زاخۆران باخۆرانەکانی گەڕەکێ کە لەپێشدا بۆم باسکردبوون هەمووی هاتنە سەربانی و وێگڕا هاواریان دەکرد ئای بگەنێ ماڵە فلان کەسی ئاوری گرت!! ئای سووتا!! تەمەشای دووکەڵ!! بەڵێ ویستم جەمێکی دەولەمەندانە رابوێرم بەڵام منداڵە وردکە لێیان کردم بە ژەهرەمار !! بە خۆشیتان دەوڵەت زیاد و ماڵ ئاوا ...

ئەی گەلۆ .....

ئەوە دڵی منی رەبەنی غەریب و غەریبە ماڵی کۆس کەوتە ،

چەندی لە ئێشە و چەندی لە ژانە و چەندی لە برینە برینە .

ئەمن دەڵێم قاسید ئەوا ن گولان چن ؟

چنوورن ، لاولاون ، پۆلە بیزانە ، شەنگە سپینە ؟

ئەمن سەد حەیف و دوو سەد موخابەنی لە دنیایەم دێتێ ،

بۆ وەی مەحبووبی جوانی جوان چاک ،

هەموو شەوێ لە حەدە حەدی نیوەشەوێدا

بە دەستێکە پڕ لە بازنە ،

بە قامکێکی پڕ لە ئەنگوستیلە ،

هەڵدەسێتەوە سەر لانکی گولێکی دەدودینە .

ئەی گەلۆ !!

ئەوە دڵی منی غەریبە ماڵی کۆست کەوتە ،

چەندی لە ئێشە و چەندی لە ژانە و چەندی لە ئۆفە وچەندی
لە ماجەرایە ،

ئەوە شەرێکە لە نێوا ن گولانی جوانی دەهەواری باسەفایە ،

شللێر دەڵێ بە هەڵاڵێ ،

هەڵاڵ دەڵێ بە بەیبوونێ ،

بەیبوون دەڵێ بە گیا خاوێ ،

گیا خاو دەڵێ بە شەش پەڕێ ،

گوڵینە با ئەمە شەرعی خۆمان بکەین .

بزانین لە نێو مەدا کێ لە هەمان جوانترە ،

لە سەر ئەو ێ کاو لە دونیایە .

ئەوە جەمعی گولان پۆل بەست دەبوون .

هەڵاڵە دەڵێ بە گیاخاوێ ،

گیا خاو دەڵێ بە شللێرێ ،

شللێر دەڵێ بە شەش پەڕێ ،

شەش پەڕ دەڵێ بە بەیبوونێ ،

دوایە بە عام دەیان نارده کن پۆپەلی شەنگەبیزایە .

جەمعی گولان پۆل بەست دەبوون ،

دەچوونە کن شەوبایە شەماڵێ کە شەوگەڕە و دەگەڕێ

لە کوێستانی دە باسەفایە .

دەیا ن کوت شەماڵ ئەتۆ شەوگەڕی و دەگەڕێی ،

سەر لە کوێستانان دەدەی و لە گەڵ گولانت سارد و سەودایە ،

وەرە شەرعمان بکە ئەگەر شەرعمان بگۆڕی ،

پێنا و دارمان بی لەسەر بەردی"صخرەالله"یە .

وەرە سەیری بەژن و بالامان کە و بڕوانە ،

کێهەمان جوانین لەسەر ئەوێ کاولە دونیایە .

شەماڵ دەڵێ : گوڵینە هەمووتان جوانن،

هەمووتان شۆخ و نازدارن ،

هەمووتان دڵتەڕ و لەبارن ،

بەڵام ئەگەر دوو رۆژانوو بارینی رەحمەتێ لێ نەدا ،

بەر دەدەنەوە سەری خەجاڵەتێ ،

سیس دەبن لە بەر ئەوێ گەرمایە ،

بەڵام سوورە گولێک هەیە لە باغی شەددادی ،

ئەو سوورە گولە پاییز و هاوینێ ،

زستان و بەهارێ ،

ساڵ دەری دوازدە مانگە ،

بە شەو و بە رۆژ لە میجازێکی دایە ،

ئەگەر ئەویشتان بێتە گەڵێ ،

نابنەوە بە خالێکی شیرین لەیلایە .

ئەی گەلۆ ..... !!

ئەو خەمی دەدڵم زۆرن ،

چەندی لە ئێشە و چەندی لە ژانە و چەندی لە ماجەرایە و
...چەندی لەوێ خەفەتێ ،

ئەمن سەد حەیف و دوو سەد موخابینی لە دنیایەم دێتێ ، ،

بۆ وێ شوخێ نازدارێ بە لێو بە بارێ ،

هەموو ئێواران بەر بەداتەوە سەری خەجاڵەتێ ،

ئەمن دەڵێم بەوی شۆخێ نازدارێ کەڵەگەتێ ،

دەبا لێدەین جەفەنگێ بکەین سوحبەتێ ،

خودا گەلێک غەفوور و رەحیمە لە بۆ رۆژی ئاخرەتێ .

ئای گەلۆ .....

---

* کەس نازانێ کەنگێ تاغووتێکی زۆردار و بێدین کچە کوردێکی هەژاری دینداری بە دیل گرتوە و خۆشخوانێکی کوردی نەخوێندەوار و ساکار ئەم گەلۆیەی بۆ گوتوە ، بەڵام دەوێرین بڵێین شاکارێکی کەم وێنەیە .

بەناوی خوای مەزن

# نەتیجەی موسابەقەی زانستی و ئەدەبی

ئینتیشاراتی صلاح الدینی ئەییووبی لە سەرەتای تێکۆشانی خۆی و بە بۆنەی سالڕۆژی سەرکەوتنی شۆڕشی پڕشکۆی ئیسلامی ئێرانەوە، دەورەیەک موسابەقەی زانستی و ئەدەبی ڕاگەیاند. هەر بەدوای بلاو بوونەوەی ڕاگەیاندنەکەماندا زانایان و ئەدەبدۆستانی کورد نامە و نووسراوەیەکی زۆریان بۆ ئەم ناوەندە فەرهەنگی و ئەدەبییە نارد، و لەو نامانەدا هەستی گەرم و پڕلە خۆشەویستی خۆیان دەربڕیبوو، و هانیان دابووین بە ورەیەکی بەرزترەوە ئەم ڕێگا سەخت و دژوارە بپێوین و لە یەکەم هەنگاودا ڕانەوەستین.

هەر وەها بۆ بەشداری کردن لە موسابەقەشدا وتار و نووسینی زۆرمان پێ گەیشت و ئێمەش وێڕای سپاس و ڕێز داوایان لێ دەکەین پەیوەندیمان لەگەڵ نەپسێنن و وانەزانن کە بە ڕاگەیاندنی نەتیجەی موسابەقە زەمینەیەک بۆ هاوکاری نەماوە، بەڵکوو بە پێچەوانە ئێستا کە بە هاوکاری ئەو بەڕێزانە توانیومانە لەپاش هەوڵێکی زۆر یەکەمین ژمارەی گۆواری "سروە" بلاو بکەینەوە بۆ درێژەدان بەم کارە و باشتر بوونی لە ژمارەکانی داهاتوودا نیازێکی زیاترمان بە هاوکاری و هاوهەنگاوی ئەوان و هەموو زانایان و ئەدەبدۆستانی کورد هەیە.

ئیمە هەر لە سەرەتای دەست پێ کردنی تێکۆشانی خۆمانەوە پالمان بە هێزی لەبن نەهاتووی بارمەتی خودا و هاوکاری ئێوەی خۆشەویستەوە دابوو، کە بەختەوەرانە تا ئێستا لە لوتفی خودا بێبەش نەبووین و خوشک و برا بەڕێزەکانیشمان بە هانامانەوە هاتوون.چ ئەو نامە پچووک بەلام بەنرخەی کە برا یا خوشکێکی لاو بۆی ناردووین و چ ئەو مەقالە و نووسراوە بەرز و پڕبایەخانەی کە لە لایەن مامۆستایانی شارەزا و بەئەزموونی کوردەوە بە دەستمان گەیشتوون هەر یەک لە جێگای خۆیاندا بوونە مایەی دلگەرمی و هەست بە بێکەسی نەکردن و شایی بەخۆ بوون و تەنانەت سەربەرزی ئێمە.

بەلام لەبارەی نەتیجەی موسابەقەکەدا، دەستەی داوەران ڕۆژی ۶۴/۱/۱۴ لە دانیشتنێکدا بڕیاریدا:

۱ ـ ئەو وتار و نووسینانەی کە لە لایەن مامۆستایانی خاوەن ئەزموونەوە ناردراون بە جیاواز هەلسەنگێندرێن و وێڕای ڕێز گرتن لە خاوەنەکانیان بەرەبەرە لە ژمارەکانی گۆواری سروەدا چاپ بکرێن. دیارە ئەگەر لەم ژمارەدا چاپ نەکرابن بەلگە نیە کە خوا نەکردە وەپشت گوێ خرابن.

۲ ـ نووسراوە و وتارەکانی دیکەش بخرێنە بەر لێکۆلینەوە و بە لەبەر چاو گرتنی ئەم ئەسلە کە مەبەست لە دیاری کردنی بەرندە و دانی جایزە زیاتر لەوەی بەربەرەکانێ و رقەبەری نێوان چەند کەس بێ، ڕاکێشانی سەرنج و نەزەری زانایان و ئەدەبدۆستان بووە، و هەروەها لەبەر ئەوەی کە هەر نووسراوەیەک لەسەر بابەتێکی تایبەتی بوو کە لەگەڵ ئەوانی دیکە جیاواز بوو هەلسەنگاندنیان پێکەوە و هەلبژاردنی باشترینیان بۆ هیچ داوەرێکی ورد بین ئاسان نەبوو، بە قورعە ئەم پێنج کەسەی خوارەوە بە ناوی بەرەندەی موسابەقە دیاری کران:

۱ ـ کاک عەزیزی ئالی، لە مەهابادەوە.
۲ ـ = کەمالی ڕەشیدی پوور، لە مەهابادەوە.
۳ ـ = لوقمانی مەتاعی، لە سەقزەوە.
۴ ـ = سەلاحی عەرەبی، لە مەهابادەوە.
۵ ـ برایەکی دانیشتووی ئورووپامان کە ویستوویەتی بەناوی ( بێ ڕێز ) بیناسێنین.

جایزەیەک بۆ ئەم پێنج کەسە و دیاری یەکیش بۆ هەموو بەشدارانی موسابەقە لەبەرچاو گیراوە کە بۆیان دەنێرین.

دیسان تکا دەکەین درێژە بە هاوکاریتان بدەن. تا بەیاری خوا گۆوارەکەمان زووتر و باشتر دەرچێ.

ئینتیشاراتی صلاح الدینی ئەییووبی

بە تینی تاوێ دەتاوێ
بەفرە بۆتە هەڵمی ئاوێ
کەوی کەوتە بەر شالاوێ
فرمیسکی دەڕژی لە چاوێ
ئاور بەر بۆتە هەناوێ

جێژنی سەر ساڵە کوڕینە
رنوو خەریکی خزینە
دنیا بوە کۆلکەزێڕینە
باغی گوڵان بێپەرژینە
کاتی شادی و پێکەنینە

رازاوە دەشت و باغ بە گوڵ
بولبول دەچوە سەر پەلک وچڵ
لەبار و جوان و گورج و سڵ
هاتۆتە ژوانێ بووکی گوڵ
دەجریکێنێ بە دڵ بە کوڵ

وەنەوشە دای گرتووە شەرم
نێرگس مەستە چاوی نەرم
سوێسن دەڵێ تاج لە سەرم
بەیبوون دەڵێ تازەبەرم
بۆن خۆش وەک عەتری قەمسەرم

هەڵاڵە نواڵەی پڕ کردن
بۆنی خۆشی هۆشی بردن
ئەو رەنگ و بۆنە خوا کردن
تەبیعەت نەقاشی کردن
خودای گەورە خەلقی کردن

کوڕادە و کاردوو و بیزا
هاتوونە دەر لەبن خیزا
کارگی کەما بە چەن فیزا
هەڵدەستاوە لەکن بیزا
پێی دان بەهار کارتی ویزا

کەنگرە وێنەی دەبانی
هاتۆتە دەر لە کالانی
جەوهەر دەتکێ لە گوێیلانی
گورزی سامی لەسەر شانی
( لێم بۆتە روستەمی ثانی)

ڕێواس گوڵینگ و کاکۆڵی
دای پوشیوە باسک و قۆڵی
کۆڵوانەی کەوتە سەر کۆڵی
راژا رژا تۆز و خۆڵی
بۆتە جوانی خڕ و دوڵی

شلیری بەژن و باڵا جوان
مەحکووم کراوە بێ تاوان
نابێ تێر بڕوانێ چاوان
لەبن کێلی کیژ و لاوان
جەرگی سووتاوە لەتاوان

هاڕەی ئاوان لەئاوهەڵدێر
باڕەی بەرخ تووڕەی بلوێر
ڕێچکەی مەڕەزاو هاتە بێر
لەو جێگایە دەبارێ خێر
چەن جوان بێری دەکەن هاوێر

## وار و زوزان

حسین مصلح ثلاآبادی (کوچەر)

رەشمال دانان ڤان کوچەرا زۆزانا
عەیدە ئیرۆ بۆ بیێری و شڤانا

دەنگێ زەنگولێ نیێری پێشکەری تێت
قەبقەبا کەڤ ل سەر بەرێ سەری تێت

سەرە شوڤان ل سەر گرێ پێش مالا
خۆش لێ ددەت بلوولێ بو هەڤالا

وەختێ بیێرێ هات و بیێری بوونە ڕیز
هات بۆ بیێرێ پەز و دەرکەت ل پاڕیز

هاتن بیێرێ گۆپال د دەست شوڤانا
پەز دانە بێر تەژی شیر ل گوهانا

ئەڤان دۆشی مهیا " رسەر " یا " تەبەش"
بزنا " کوچ " و "بزنا "پۆش"وبزنا " قەش"

ئینان و تەشت و مەنجەلا کرن شیر
هەیوان لێدان داکو شیر ببە پەنیر

ئەڤجار چوونە سەرکاروبارێ مەشکا
دالێ بگرن روون و شیرێژ و کەشکا

دەنگێ مەشکا خۆش کەتە ناڤ گەلیا
بیێریوانا کەیفا دلێ کول لێدا

شوڤانا پەز هاڤژۆت بۆ پشتە ڕۆژێ
ڕۆژ بوو بلند گەلۆ وەختێ نوێژێ

پاش نوێژ و پاش فراوین خوارنێ
پەز راکرن دیسا بۆ چەراندنێ

خودیڤۆ چەند خۆشە دل و عەیشێ ڤان
چ جار ژ وان نەستینە پەز و حەیوان

گەلۆ هۆیە ژینا خودانێ پەزا
خودێ بلند نەکە دەستێ نەحەزا

بلا کەیفا بیێری و شوڤانا خۆش بیت
بلا گورگێ نەیار ب غاردان بچیت

«کوچەر» نەکەی خەلەت بچی بو ڤارا
بەر سەر بیێرێ بچی وەکی خڕ جارا

دی رابیت ئاگر ژ تە وەکی سۆبێ
د ئەڤینێ نادەی مەم و زین نۆبێ

# پەرستار

دنیایەکی خۆش و ئاسایی ، منداڵ کایە دەکەن ، پیرجەفەنگان لێ دەدەن ، کیژ بە ناز رادەبرن ، کوڕە لاو چاو دادەگرن ، تازە ماڵ بیری داهاتوو دەکەن ، .... مەل لەسەر لکان دەکەن بازباز ێن ، دەنگی مۆسیقا لە چەپەری کەپرێکی چۆلی بەهاری یەوە دێتە دەرێ ، شنەیەکی هێدی لک و پۆپی رووتی گەڵای داران دەبزوێنێ ، رووباری شار وەک مار بە هێمنی دەخوشێ و دەڕوا .

وارشی کەوی بەرەو قوبلەی ( خەززایی ) خۆی سوور کردۆتەوە ، شینکە سەری وەدەر ناوە ، لەلای رۆژهەڵاتی شار چیاکان رەشبەڵەک بوونەوە ، زەوی گەرم و بۆش بۆتەوە چڵ چڵ بۆ وێنە گەزیزە رواوە و مزگێنی بەهار دێنن هەست بە وەزینی بای وەعدە دەکرێ و لە سەر نیگاری بەعەزەمەتی ئاسمان هەوران شەقڵ و شوێن دەکا .

لە نەکاو ، هەموو شت ، گاڵتە و گەپ ، دەست بزێوی ، زەین دان بە سروشت ، بیستنی مۆسیقا ، لە بیر چوونەوە تەنیا گیان رزگار کردن لە بیر بوو . چەند باڵداری بەسام زەوی و ئاسمانیان هێنایە لەرزین و دەنگی گوێکەرەیان بەسەر خەڵکدا مراند ، مژ سیغارێک پێچوو دووکەڵە شینکە و تەپ و تۆز لە هەرد بەرەو حەوت تەبەقەی ئاسمان بڵیند بوون ، دەیان گیان و وۆحیان کێشان وەک لافاو وەپێش خۆیان دان و بردیانن .

هاتمەوە سەرخۆ چەند رۆژە بێ زمانم ، لە نەخۆشخانە راوێژکەرم ، پەرەستارێکە بە تەواوی هێزی ئەوین و تاسەو ئاواتیەوە دەربەست لە چارەسەرکردن وساڕێژی برینمدایە وەک پەری شوخ و شەنگ لیباسێکی سپی و بێ پەڵەی دەبەردا ـ یە ، گەر لێم دوور دەکەوێتەوە دەڵێی بەسەر تارە دەماری خوێنمدا هەنگاو دەنێی ....

**********

رۆژێک بەو بەژنی دڵڕفین و مامزانەی هات گوڵێکی سووری دامێ . لە بیر چوونەوە برینی لەشم ، لە شانی بێ گیان ، خانووی خاپوور ، وەتاغی کاولاش ، خزم و دوست تەنیا بیرم ئەو گوڵە سوورە بوو کە دایبوومێ.

# تەوری جەور

## هێمن

دژمنی کوردی نیە ئەفلەقی دلڕەق بە تەنێ
ریشەئی خەڵکی عیراقێ دەیەوەی هەڵبکەنێ

لە عیراق نازی شتێکی بەری چاوی بگرێ
هەر بە تەورێ دەبڕێ زاڵمە نەخل و دەوەنێ

عەرەب و کورد و تورک ، ئەرمەنی و ئاشوری
دەگرێ ، یا دەکوژێ ، وەک بوتێ سەجدەی نەبەنێ

زیڕی چی ؟ ئاسنی ژەنگاوی و تیژە سەددام
کۆنە ناسۆری ئەون ئێستە کە دێنن تەشەنێ

کوشتی سووتاندی و بردی لە جنووبی ئێران
وەک مەغوولێ کە لە خۆی رازی بکا ئەهریمەنێ

ئەوی ئەو کردی بە نامەردی دەگەڵ کوردستان
شەختە نەیکرد بە گوڵ و نەستەزەن و یاسەمەنێ

مووشەک و بۆمی لەدێ و شاری وڵاتی هەڵکرد
خەڵکی ئاوارە بوو بۆ دەشت و تەلان و دەمەنێ

گوللە داباری وەکوو تەرزە لەسەر پیر و جوان
تەرزە کوانێ بەزەیی دێ بە گوڵ وگیای چەمەنێ؟

وا بڵاو بۆتەوە جەیشی بە پەلاماری بەجێ
تازە کۆ بێتەوە دژوارە بە بێڵ وبە شەنێ

خۆی بە نێرۆن و بە چەنگیز و بە هیتلر زانی
نەیدەزانی دەدرێ مشتی گرانی لە چەنێ

دەستی بێگانە دنەی دابوو کە خۆی هەڵدێرێ
کە چی راچوو لە پەڕەی جەرگی پەلی دارەبەنێ

لەوەتی هەڵمەتی شێرانەی خەڵکی دیوە
خەوی تۆراوە ، بە شەو رادەپەڕێ ، رادەچەنێ

ماوەیەک مەستی مەیی بەرزە دەماخی بوو بەڵام
کاتی وەی هات کە خومار بێتەوە لووت دابژەنێ

ئەو کە نەیهات بەزەیی قەت بە هەژار و بێکەس
رۆژی تەنگانە ئەوان چۆن دەبێ دەستی نەکەنێ ؟

کەس نیە جەرگی بە کوچکێوە نەنابێ سەددام
چۆن دەبێ جەرگی ئەویش خەڵکی بە کوچکێوە نەنێ

چۆن دەبێ باکی نەبێ ئەولە ( أَخْ )و (أُخْت)ی عەرەب
چۆن نەجاتی دێ لەدەس مامە رەش و پوورە نەنێ ؟

ئەو کەسەی هانی دەدا ئاگری شەڕ رۆشن کا
ناچتە هانای کە کەوت تێر و پڕیش ، پێ دەکەنێ

تازە رزگاری لەدەس خەڵکی عێراق دژوارە
هێندە پێناچێ هەموو دەور وبەری لێ دەتەنێ

چی لەدەس نایە ئەگەر خەڵکی عێراق ئەمڕۆکە
راپەڕن ، یەک بگرن ، دەس دەنێ ، رامالی دەنێ

ئەمەیە ئاقیبەتی شوومی لەخۆ بایی بوون
چارەنووسی ئەمەیە دژمنی خەڵک و وەتەنێ